دەزگای ستاندەر بۆ راگەیاندن و توێژینەوە

(٢٢)

# چارەنوسی پارتی دیموکراتی کوردستان دوای ڕیفراندۆم

نۆڤێمبێری ٢٠١٧

# چارەنوسی پارتی دیموکراتی کوردستان

# دوای ڕیــــــفرانـدۆم


ئەندامانی بۆردی توێژینەوە

قارەمان نادر محەمەد

کاوە تەیب جەلال

کاروان نەجات عومەر

خەسرەو عەبدولڕەزاق حمدامین

محەمەد موحسین ئەنوەر

سەرپەرشتیاری توێژینەوە

مەسعود عەبدولڵخاڵق



ستاندەر

STANDARD

WWW.SKURD.NET

دەزگای ستاندەر بۆ ڕاگەیاندن و توێژینەوە

**ناوی توێژینەوە:** چارەنوسی پارتی دیموکراتی کوردستان دوای ڕیفراندۆم

**ئامادەکردنی توێژینەوە:** بۆردی توێژینەوەی دەزگای ستاندەر بۆ ڕاگەیاندن و توێژینەوە

**ژمارەی توێژینەوەی:** 22

**مێژوی بڵاوکردنەوە:** نۆڤێمبەری 2017

# ناوەڕۆک

# دەروازە

لە ڕۆژی ٦\٧\٢٠١٧ بە بڕیاری ( پ.د.ك - ی.ن.ك - یەكگرتوو - شیوعی و هەندێ حیزبی دیکە و پێکهاتەکان) ڕۆژی ٢٠١٧/٩/٢٥ دیاری کرا بۆ ئەنجامدانی ریفراندۆم، هەرچەندە ئەم پرۆسەیە مافێکی سروشتی گەلی کوردستانە، بەڵام لەبەر ناسکی بارودۆخی ناوچەکە و ڕۆژهەڵاتی ناوەراست وردەکاری سیاسی و یاسایی زۆر دانایی دەوێ، ئامادەسازی و بینای دەوێ، ئەوەش نەکرابوو بە جوانی، عاقڵمەندان و دۆستانی کوردستان لە ناوەخۆ و دەرەوە داوایان کرد ئەنجام نەدرێت، بەڵام بەجۆرێک لە گوێ پێنەدان و عینادی کرا، کە بەهۆیەوە باشوری کوردستان پشتیوانی نێودەوڵەتی لەدەستدا، بەتایبەتی ئەمریکا. ئەمەش وایکرد وڵاتانی ناوچەکە جارێکی تر وەک سەدەی بیستەم (سەردەمی بێ پشتیوانی بۆ کوردستان) دیوارێکی زیندانی بەدەوری هەرێمی کوردستان کارابکەنەوە، ئیتر شکست لەدوای شکست رووی لە باشوری کوردستان کرد، بەرامبەر ئەو شکستانەش بەرگریەکی ئەوتۆ نەکرا، بەڵکو دەستکرا بە بەخشیونەوەی شکستەکان و سازش و هەتا گەیشتە سڕکردنی ریفراندۆمیش، کار گەیشتە ئەوەی بەرگەی فشاری سەربازی نەگرن و تەواوی ناوچە جێ ناکۆکەکان بە کەرکوکیشەوە (کە دەکاتە 51%ی خاکی کوردستان) لەدەست بدەن، بەشێکی بەرێکەوتنی نهێنی و بەشێکی تر بەرێکەوتنی ئاشکرا، لەلایەن هەردوو حیزبی دەسەڵات کرا.

ئەوانە هەمووی کاریگەری سەخت و خەستی کردە سەر چارەنوسی حیزبەکان، لەو توێژینەوە تیشک دەخەینە سەر چارەنوسی (پ.د.ک) و لەتوێژینەوەی داهاتوو تیشک دەخەینە سەر چارەنوسی (ی.ن.ک)، بۆ ئەوەی سوودبەخش بێت بۆ خوێنەرو خودی ئەوحزبەی تویژینەوەی لەسەر دەکرێت کە بەهەلەیان نابەین و وێنەیەکی ڕاستەقینەی خۆیان بۆ داهاتوو پیش کەش دەکەین ، ئەوەش نەك هەر (پ.د.ك) زۆربەی حزبەکوردستانیەکان بەو ڕەخنەو هەلسەنگاندنانە سوپاسگوزارنین بەلکو سەغلەت دەبن.

# ناسینێکی پارتی دیموکراتی کوردستان

پارتی دیموکراتی کوردسان له8/16/ ١٩٤٦ دامەزرا، له ١١ ی ئەیلولی ١٩٦١ شۆڕشیان دەست پێکرد بەڕابەرایەتی مەلا مستەفا، یەکەمجار (پ.د.ک) بەشداری نەکرد بەڵکو بە (ڕجعی)شی لەقەڵەمدا، دواتر هاتنە ناو شۆڕش، لە (١١ی ئازاری ١٩٧٠) عێراق دانی نا بە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و لەگەڵ ملا مستەفا رێککەوتن بۆ ماوەی (٤) ساڵ، حزبی بەعس لە پیلان بوو تا ساڵی ١٩٧٤ جەنگ دەستی پیکردەوە، دوای یەک ساڵ لە پەراوێزی کۆنگرەی (ئۆپیک) لە جەزائیر لە ١٩٧٥/٣/٦ (شای ئێران و سەدام حوسێنی جیگری سەرۆك کۆماری عێراق) بە ئامادەبوونی (هواری بومیدیان-سەرۆکی جزائری ئەوسا) و ئەو (عبدالعزیز بوتەفلیقەی ئێستا، ئەوکاتی وەزیری دەرەوە بوو)، بەدەستخۆشی "ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا" شکستیان بەو شۆرشەو خودی (پ.د.ک) هێنا و کۆتایی هات، دوای ئەوەی (ی.ن.ک) شۆرشی نوێی دەست پێکردەوە ئەوانیش (سەرکردایەتی کاتیان) دروست کرد، لە ڕاپەڕینی ١٩٩١/٣/٥ هاتنەوە کوردستان بەلاوازی وەک هێزێکی دووەم لە چوارچێوەی بەرەی کوردستانی.

لە یەکەم هەڵبژاردنی ١٩٩٢/٥/١٩ لەڕابەری دەنگی یەکەمیان هێنا بە ڕێژەی ٤٦.٢% پەرلەمانی (٣٣٧٨٧٩ دەنگ) ڕابەری (٤٦٦٨١٩ دەنگ) لە ٤٨.٣% ، بەو شێوەیە لە لیست (١٤٠٤٦) دەنگ زیاتر لە یەکێتی و لە ڕابەریش (٢٥٦٧٢) دەنگیان زیاتر بوو، بەجۆرێک بانگەشەی سەرەکی (پ.د.ک) بۆ ئۆتۆنۆمی بوو یەکێتیش بۆ فیدراڵی بوو، دوای کۆکردنەوەی دەنگەکانی تری

حزبەکانی تریش دەنگی (پ.د.ک) بوە ٥١% دەیتوانی حکومەت دروست بکات بەتەنها، دوای دروستکردنی حکومەتی (٥٠ به ٥٠) لەگەڵ یەکێتی ، شەڕ بە پارتی فرۆشرا،زنجیرەیەک شەڕی براکوژی لە نێوانیان دروستبوو ، لە کۆتایی مانگی ئاب ١٩٩٦ خولی سێیەمی براکوژی زۆر بەسەختی هەڵگیرساوە بە هێرشێکی هەمەلایەنەی (ی.ن.ک) و (پ.ک.ک) و هەندێ حزبی تر و کۆمەڵێک هۆز و تیرەی ناوچەکە، (پ.د.ک) بەتەنها مایەوە و کەوتە مەترسی و هێزەکانی داڕووخا و بەرەکانی جەنگیان بەجێهێشت، بەو شێوەیە لە (٣١ی ئابی ١٩٩٦) بەڕەسمی لەلایەن سەرکردایەتی (پ.د.ک) داوای سوپای عێراق لە سەرۆکی عێراقی (سەدام حوسێن) کرا و بەیەکەوە هێرشی بەناوی (توکل علی الله) کرایە سەر هەولێر و داگیریان کرد، دوایی بووە هۆی شکستی سەرانسەری (ی.ن.ک) لە هەرێمی کوردستان، دواتر جارێکی تر یەکێتی (بە پاڵپشتی تۆپخانەی ئیران) هێرشی کردەوە دیسان هێزەکانی (پ.د.ک) توشی داروخان و بەرەی جەنگیان بە جێهێشت، دواتر (پ.د.ک) هێز و سوپای تورکیایان هێنا و (پ.د.ک) رزگاری بوویەوەو شەڕی براکوژی وەستا.

لە دوای رێکەوتنی ستراتیژی لە (٣٠ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ ) نێوان یەکیتی و پارتی دەستی بەسەر زۆربەی جومگەکانی دامودەزگای هەرێمدا گرت. ئەگەرچی لەناو میللەت دەنگی لەکەم بوون بوو (لە یەکەم هەلبژاردن ٥١% لەدووەم بۆ ٤٨% لە سێیەم بۆ ٤١% لەچوارەم بۆ ٣٨%)، بەڵام لەسەر ئاستی ماددی و سەربازی و سیاسی و دیپلۆماسی زۆر بەهێز بوو، هاوسەنگیە (پەنجا بە پەنجا) گۆڕا، پارتی بوە هێزی یەکەم، وایلێهات

زۆربەی حزبە کوردستانیەکان بەدوایکەوتن بۆ بڕیارە چاک و خراپەکانی (جگە لە:گۆڕان و کۆمەڵ)، تا بە ریفراندۆمەوەش بەسەرکەوتویی کرا. لەدوای ریفرادۆم شکستی زۆر گەورە رووی لەو حیزبە کرد. تا ئەو ساتەش گرنگترینیان ئەوانەی خوارەوەیە:

یەکەم: ئەو رێکەوتنە سیاسی و سەربازی و ئابوری و ئەمنی لەگەڵ تورکیا هەیبو تێکچوو. لەوەش زیاتر تورکیا بوو بە بەشێک لەپیلان دژی ئەو حزبە.

دووەم : تەواوی ناوچە جێناکۆکەکان لەکەرکوك تا شەنگال کەوتەوە دەست هیزە عێراقیەکان .

سێیەم: داخراني هێلە ئاسمانیەکان، دەستگرتن بەسەر خاڵە گومرگیەکان.

چوارەم: دەستگیرا بەسەر زۆربەی داهاتە نەوتیەکانی.

پێنجەم: پەیوەندی نێودەوڵەتی وئیقلیمی تێکچوو.

شەشەم: دەستی کرد بە تەنازول کردن بۆ عێراق و کۆمەڵێک رێکەوتنی لەگەڵ حەشدی شەعبی و سوپای عێراق کرد( لە رۆژانی10/28 تاکو ٢٠١٧/١١/٣ لەشاری موسل بەسەرپەرشتی کریم سنجاری لای پارتی و لای حکومەتیش عوسمان غانمی ) بۆ تەسلیم کردنەوەی بەشیکی زۆری خاکی کوردستان .

حەوتەم : لەو سەروبەندە لەبەرواری 2017/10/29 مەسعود بارزانی لەژێر فشاری نێودەوڵەتی  دەستی لەکارکێشایەوە لە پۆستی سەرۆکایەتی هەرێم.

هەشتەم  : وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و بەریتانیان و فەرەنسا خۆشحاڵی خۆیان بە نەمانی مەسعود بارزانی دەربڕی.

نۆیەم:  وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا پشتگیری خۆی بۆ حکومەتەکەی نێچیرڤان بارزانی و قوباد تاڵەبانی دەربڕی و مانایەکی ڕوونیدا و هانی هەردوو حیزبەکەی دا بۆ  بۆ جێگرەوە  لەنەوەی نوێ بۆ ئەو حیزبانە لەجیاتی ئەو دەستە سەرۆکایەتیە و مەکتەب سیاسیەکانیان.

دەیەم : چەندین دۆسیەی مەترسیدار ئامادەکراو ە دژی هەریم (زیاتر دژی پ د ک وخودی سەرۆکی هەریم) ،لەوانە  دۆسیەی :

١- هێنانی سوپای تورکیا بۆ ناو هەرێم ومانەوەیان تائەو ساتە.

٢- دۆسیەی کەوتنی موسل و سنجار ، قاچاغی و بازرگانیکردن بە نەوتی ژێردەستی داعش.

٣-پرسی فرۆشتنی نەوت و داهاتەکانی بەشێوەی سەربەخۆ بەتایبەت ئەو بیرە نەوتانەی پەیوەندی بە سنوری کەرکوک هەیە

هەموو ئەوانە وای کرد دیزاینێکی نوێ لەپەیوەندی یاسایی و سیاسی و ئیداری و ئابوری لە نێوان هەرێم و بەغدا بخەملێ، تیایدا پێگەی (پ د ک)بە خیرایی بەرەو لاوازی بچێت ، بەکورتی باسی دەکەین.

# حیزبێکی گەورە لە فیدرالیەکی گەورە بۆ بچوک بونەوە

ئەو حیزبە مێژوویکی پڕ خەباتی هەیە و بە حیزبی دایك دادەندرێ لەناو حیزبە کوردستانیەکان، بەشێوەیەکی گشتی شکست و سەرکەوتنی زۆری بینیوە، بەڵام جێگای متمانەی خەڵکی کوردستان بوە، بەتایبەتی متمانە بە مەلا مستەفای بارزانی زۆر بێوێنە بووە، هەتا لە شکستی (١٩٧٥) یش نەبوە هۆی ئەوەی متمانە لەدەست بدات، بۆیەش جارێکی تر زیندو بویەوە لە ژێر سەرکردایەتی (مسعودبارزانی)، ئەگەر چی لەبەرامبەر یەکیتی لاواز تر بوو لەخەباتی شاخی ، ئەو شۆڕشی نوێ ی هەڵگیرساندبۆوە و قارەمانیەتی زۆر زیاتر بو لە (پ.د.ک) ،بەلام لەهەڵبژاردنی ١٩٩٢ دەنگی یەکەمی هێنا، دەنگەکانی بارزانی لە دەنگی حزبەکەی خۆشی زیاتر بوو بە (١٨٩٤٠) دەنگ، ئەو زیادەیە زۆر مانای لێ هەڵدەهێنجرێ مانای وایە خەلکی کوردستان کەمتر دەروانن پرۆژەو پەیرەو بەلکو دەروانن کەسی یەکەمی ئەو حزبە کەلەسەروو باسمان کرد متمانەیەکی زۆر بە مەلا مستەفا واهەبوو ،هەتا ئەگەر شکستیش بهینیت بەهۆی دلسۆزی و نەبوونی فاکتەری بابەتی بوە نەک زاتی ، ئەو متمانەیە وەک میرات بۆ (مسعود بارزان)یش مایەوە بۆیە ئەو دەنگە زۆرەی هێنا دوای جاریکی تر لەهەلبژاردنی ...دەنگی نزیکەی 70% ی هینا ..ئیتر لەوە بەدواوە ئەو حزبە وەک (حزبی سەرکردە) کارەکانی لەکوردستان بۆچوەتە سەر ، بەڵام شان بەشانی ئەو سەرکەوتنانەیان پانتایی گەندەلی (چەندایەتی و چۆنایەتی) وولاتی داگیرکرد، هەرچەندە لە رۆژانی یەکەمی راپەڕین مسعود بارزانی

دژی دزی وگەندەلی وتالان وئاودیو کردن وەستا، بە مافیای وەسف کردن، بەو هۆیەوە لەو سەردەمی شەعبیەت وشەرعیەتی زۆر زیاد کرد، تارادیەک خۆ پارێزی لە گەندەڵی هەبوو تا رێککەوتنامە ستراتیژیەکەیان لە گەڵ یەکێتی لە 2005 وەرچەرخانی مەترسیدار بەسەر ئەو حزبە هات

**وەرچەرخانەکە :** ئەو حزبە دەرفەتی زۆر زێرینی بۆهاتە پیش ،نازێکی زۆری پێدرا ،بەتایبەتی بۆ کاك مسعودبارزانی ، بۆیەکەم جار کیشەی مەلایی وجەلالی لە پیش لادراو خودی مام جلال وباقی (م س)ی یەکیتی خۆیان مامال دەگەڕان بۆکۆکردنەوەی دەنگ بۆ بارزانی ، دوایش یەکیتی زۆربەی جومگە گرنگەکانی بۆئەو حزبەو خودی سەرۆکەکەی بەجێهێشت ، خودی نەوشیرەوان مستەفا چەند جار بەتەنها هاتە لای وهەمو دەسەلاتیکی پیدا ،لایەنە ئیسلامیەکان پالپشتیان کرد ، ئیمکانیەتیکی مادی یەکجار زۆر کەوتە دەست ئەو حزبە ،بیجگە لە پشکی 17% هیشتا نەوتیان بەقاچاغیش دەفرۆشت ،داهاتی کوردستانیشیان نەداوەبەغداو هەر بۆئەو حزبە بوو ، پەیوەندیەکی نیودەولی بەهیزی بۆپەیدا ببوو ، ئەگەر چی ئەو پەیوەندیەو ئەو هەمو سامان و دەسەلاتە زۆربەی جار بە خراپی بەکاردەهات لەلایەن ئەو حزبەو سەرکردایەتیەکەی کەچی هەمو لایەك بیدەنگ بوون ، ئەو حزبە بە 38 کورسی کەوتبوە سەرووی یاساو پەرلەمان ودادگاو لێپێچینەوە ، کەچی لەدواییدا شکستی هێناو هەریمی کوردستانیان لەهەمو ئاستەکانی (نیشتمانی –ئابووری –سیاسی – ئیداری –فەرهەنگی–تەعلیمی ) بە وێرانی بەجێهێشت ، لەهەموی سەرنجراکیش تر بەدەیان ملیار دۆلار قەرزاریشن ، ئەو هەمو ئیمکانیەتە

لەبەر دەست بێت ئینجا شکست بهێنی ، جاریکی تر ئەو دەرفەتە دووبارە نابیتەوەو متمانەی میلەتیش لەق بوو ، هەر لە ڕاستیشدا لەو دواییە ئەو حزبە لەسەر ڕێبازی بارزانی نەمابوو وەك خۆیان ئەو حزبەیان بەو ریبازە وەسف دەکرد ، بۆ زیاتر سەرنج بدە ئەو لیستە جیاوازیەی نێوان کەلتور و فەرهەنگی مەلا مستەفا وشۆرشی شاخ و سەردەمی ئێستای بەرپرسانی (پ.د.ک) لە ساڵی ٢٠٠٧ بەدواوە :

١- سەرۆکی هەموو کوردستان بوو، نزیکەی ٩٠%ی میللەتی لەگەڵ بوو . کەچی سەرۆکی ئێستا تەنها سەرۆکی حزبەکەیە، دەنگی حزبەکەش زۆرکەم ودەڤەریە .

٢- سەرکردەیەکی ئاینی بوو، قەدەغە و (بکە و مەکە)ی بەو تەرازووە بوو. کەچی سەرکردەی ئیستای  قایلە بەبنەمای نادادگەری وەک تەرازوو بۆ بڕیار و قەدەغە و هەڵوێستەکانی دادەڕێژآ.

3- لەبەر دەرگای دوژمن نەبوو، سەودای لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی نەدەکرد. ئەو هێڵە بەزێندراو جاریش وایە تاڕادەی پێچەوانە.

4- میللەت یەک ڕێز و یەک مەبەست بوو، جیاوازی حزبی و ناحزبی نەبوو. هەرچی ئێستایە میللەت پەرتەوازە و پارچەپارچەیەو فرەمەبەست و جیاوازیەکی زۆری حزبی و هاووڵاتی هەیە.

5- سەرکردە و پێشمەرگە و حزب لە خزمەتی میللەت بوون. لە ئێستادا میللەت کراوە خزمەتکاری حزبی و بەرپرس.

6- دیاردەی ڕاستگۆیی و متمانە و دەست و داوێن پاکی و دڵسۆزی و ئەمەک و سپاردەیی و خۆنەویستی و پەروەردەیی و ئازایەتی و بەرگری نیشتمانی لەنێوسەرکردەو پێشمەرگەو حزب و میللەت باڵی کێشابوو ، کەچی لە ئیستادا دیاردەی دەست پیسی، بێ متمانەیی، خۆویستی، گوێ پێنەدان، نەساغی، قۆپیە، بێئینتمایی، شلۆقی نیشتمان پەروەری، بێوورەیی و بەرگری،.. تەنیتەوە.

٨- ئەندامی حزبی و پێشمەرگە هەتا دوای ڕاپەڕینیش بریتی بوو لە کەسێتیەکی بەڕێزی کاریگەر و بەرژەوەندی گشتی خستبووە سەرووی بەرژەوەندی تایبەتی. ئەندامی ئێستا بریتیە لە کەسێتیەکی لەرزۆک بەرژەوەندی تایبەتی خستۆتە سەرووی گشتی، سەرپێچ و یاساشکێنە.

٩- پابەند بوون بە فەرمانی سەرۆک.ئیستا پابەندبوون بەفەرمانی مادە .

١٠- بەرپرسی مانای بوونی لە بەرەی پێشەوە و دڵسۆزی و خۆشەویستی و بێ مال و سامان و سادە.. بەرپرسی ئیستا مانای دەوڵەمەندی و خاوەن کۆشک و تەلار و باخچە و کۆمپانیا و.. مانای لەسەرووی میللەت و یاسا و خاوەن ڤیتۆ... خۆبەزلزانی.

١١- پاڵنەر بۆ بوون بە حزبی خزمەت و کوردایەتی و خۆشەویستی سەرۆک بوو.. خۆبەخش بوو لەوەوە ناوی (پێشمەرگە) هات. هەرچی ئیستایە پاڵنەری بنچینەیی مادەو سەرپێچی و خۆدەرخستن و یان لەپێناو هێنانەدی مەرامێکی تایبەتی .

١٣-له سەردەمی مەلا مستەفا له نێو ئەندامانی پارتی باس باسی کوردایەتی وبەرگری و خۆنەویستی ودادگەری بوو .. لەسەردەمی مسعود بارزانی باسی پارەو ئۆتۆمبیل و ڤێلاو وشتی تربوو .

١٤- سةرۆکی ئةوسا زۆر باوەڕی بەحزبایەتی نەبوو به(بەلاوتەفریقه)وەسفی کردوه ...لة ئیستادا بەدەمارگیریەوە حزبایةتی دەکەن لەشیوەی مزایەدە .

ئەو بەراوردە ڕەها نیە ، گشتیە ، دەشێت هەندێ نەرێنی لەو سەردەمیش هەبووبێت ، بەلام هیلە گشتیەکە سەلامەت بوو، هەرچی باری ئیستای (پ.د.ك) ە زۆر بەترسناکی رووی لە گەندەڵی و تاڵانی کرد و بە ئاشاکرا سەرکردە و کادیرەکانی باڵای بوونە خاوەن کۆمپانیا و ملیۆن و ملیار دۆلار، هەرچەندە مسعود بارزانی چەند جارێک دژیان وةستاو بەرنامەی رووبەروبونەوەی گەندەڵی و چاکسازی راگەیاند بە تایبەتی لە (٢٠٠٨ – ٢٠١١ – ٢٠١٥ - ٢٠١٦)، تا ئیستا (٥)جارئەو بەلینەی داوەو جێ بەجێ نەکراوە ، بارزانی ترساوە چاکسازیەکە وەك بیرۆسترۆیکای گۆرپاتچۆڤ بەسەر خۆیاندا وەرگەڕێ، بەڵام شەپۆڵی گەندەڵی و تێکچوون زۆر لەوە گەورەتربوو، بەشێك ئێیان وایە هەر خودی (چاکسازیەکانیش)بەشێك بوو لە پرۆسەی گەندەلی یان پەردەپۆشکردنی ، زیاتر لەوەش بەشێکی تر پێیان وابوو خودی ریفراندۆمیش بۆ ئەو پەردە پۆشیە بوە ، بەتایبەتی ووتارە ناکۆکەکانی بەرپرسان لةبارةی ئامانجی ریفراندۆم ، وەک نەزەریەیەکی گەندەلی لەکوردستان باس لەوە دەکرا کە ئەوگەندەلی و کیشانەی لەو ٢٥ سالەی چارەنەکراوە بە ریفراندۆم و بوون بةدەولەت چارە

دەكرێت ،...دەتوانین بلێین گەندەلی بوە هۆی شكستە گەورەكان ، تاگەیشتە ئەو رادەیەی زۆر بەی حیزبەكان و بەتایبەتی (پ.د.ک) ئەو وەسفانەی خوارەوە هەڵگرێ:

١- لە حیزبێكی كوردایەتی و نیشمانی وەچەرخا بۆ حزبی پۆست و سودمەندی و سەرپێچی یاسایی و نیشتمانی...

٢- خەرجی ئەو حزبە مانگانە زیاتر لە ٥٠ ملیۆن دۆلارة بیجگە لەوەی قورسایی تریشی خستۆتە سەر خەرجی حكومەت .

٣- لە پێشودا لە ناو خەڵک و ناو هەژاران ریشەی داكوتابوو وەچەرخا بۆ حیزبێكی بورجوازی و دژی هەژار و پێویستی بە زیندان و ئاسایش و هێز بوو بۆ مانەوەی خۆی.

٤- لە هەڵبژاردنەكاندا سەرەڕای بوونی ئەو هەموو دامودەزگا و پارە و هێز و پۆست.. هێشتا پێویستی بە تەزویركردن هەبوو، لەگەڵ حزبێكی وەک بزوتنەوەی گۆڕان كەوتە منافەسە كە نە پارە و پول و نەدەسەڵات و ... نەبوو، كە نەیتوانی بێ تەزویر زاڵ بێت بەسەریدا.

هەمو ئەوانە حزبیكی دارزییوو لەرزۆكت بۆ بەرهەم دەهینی نەتوانی بەرگەی هەورازیک بگریت كە لەدوای ریفراندۆم هاتە پیشی .

**پەیوەندی هەرێم و بەغدا دوای ریفراندۆم :** پێش ریفراندۆم هەر بەناو سیستەمی فیدراڵی بو ، لەراستیدا دەولەت بو لەناو دەوڵەت وەبگرە زیاتر، بەڵام لەدوای ئەو شكشت و نەكسەیەی (پ.د.ک) لەگەڵ توركیا و

لەدەستدانی پشتیوانی نێودەولەتی(نیوانی هەرێم و بەغدا) لە هاوسەنگی و هاوتایی داکەلا، بەڵکو جۆرە فیدراڵیەک دەبێت پابەند بە دەستوری عێراقەوە، لە باشترین دۆخی دەتوانێ بەرجەستەی مادەی (١١٧) ی دەستوری عێراق بکا بۆ مانەوەی( ئەو دەستورە زیاتر لە ٦٠ جار ناوی ئیتحادىو فیدرالی تیا هاتوە)، ئەگینا سەرکردایەتی کورد ریزی ناوخۆی وا پەرت و بڵاوکردوە، وابێمتمانەی کردوە ئەگەری ئەوەش هەیە سیستەمی فیدراڵی پارێزگاکان پەیڕەو بکات، لەو دەمە بەپێ ی ئەو واقیع و سێکتەرە کاریگەرەکان ئەوەیە بەغدا دەبێتە تاکە مەرجەعی کوردستان، واتە کوردستان کەوتەوە بەر رەحمەتی عێراق، ئەوەش گۆڕانکاری لە هێزی پێشمەرگە و ئاسایش و پارێزگاری لە سنورەکان و پەیوەندی دەرەوە و دیبلۆماسیەت و پرسی نەوت و داهات ... زۆر لای تر لە دەست هەرێم نامێنێت، ئەوانەش بە دەوری خۆی کاریگەری یەکجار زۆر لە هەردوو حیزب بەتایبەت (پ.د.ک) دەکات، ئەو دەستکرانەوەی جاران لە سەرف کردن وتەخشان وپەخشانە و گەندەڵی و بێ دامەزراوەیی و سەرپێچی یاسایی... نامینیت ، کە بەشی زۆری چاڵاکی و بەرگەی مانەوەی ئەوحیزبە دەسەڵاتانەی پێکدەهێنا.

نەمانی ئەو ئیمتیاز و خەرجی و دەسەڵاتە زۆرە (بەکارهینانی بۆ حزب) ئەگەری زۆری هەیە حزب بچوک بێتەوە، یەکەم هەنگاوی بچوکبونەوەش بریتی بوو لە دەستدانی ناوچە جیناکۆك و ئینجا دورخستنەوەی مسعود بارزانی، کاردانەوەکانی جەماوەرە تایبەتیەکەش گوزارش بوو لەو ژانە، رەنگە بچوکبوونەوەی چەند قۆناغێک ببڕێت، بەپێی ئەو ئیجرائەتە

دەستوری و یاساییانەی رووبەڕووی بەشی زۆری حیزبەکان دەبێـەوە، بەڵام چونکە (پ.د.ک) لە سەرووی دەستور و یاسا و سیستەم سودمەند بوە، بۆیە زیاتر ئەو دەگرێتەوە، لە دەستوری عێراقی(مادةی 9) و یاسای حیزبەکانو یاسای هەلبژاردنی عێراق ڕێ بە چەکداری حزبی نادات ، لەهەریمی کوردستانیش لە بڕگەی (3) لە مادەی (15) لە یاسای حیزبە کوردستانیەکانیش رێ نادات حیزب چەکدار و میلشیا و پێشمەرگەی و ئاسایش و زیندانی هەبێـت، بەهەمان شێوە لە بڕگەی (2)ی مادەی (4) یاسای ژمارە (16) چەك لەهەریمی کوردستان رێ نادات بە حیزبی چەکدار، یەکەم بڕیاری حکومەتی عێراق لە ٢٠١٧/١١/٢ نا بێت هیچ حیزبێک بەشداری هەڵبژاردن بکات ئەگەر چەکداری هەبێـت، بەوشێوەیە دەبێ (پ.د.ک) چەکداری نەمێنێ، ئاسایشی نەمێنێ، زیندانی نەمێنێ، موچە و بودجە و ئەو دەسەڵاتە کراوەیەی نەمێنێ، کەواتە زۆر بچوک دەبێتەوە، ئەگەر رووبەرووبونەوەی دارایی و ئەمنی و پرسی تریش هەیە .

# هەڵە ستراتیژییەکانی سەرکردایەتی (پ.د.ك)

لیستێکی دوورو درێژ هەیە لەو هەڵەو چەوتیانەی سەرکردایەتی ئەو حزبە کردوویەتی و باسکراوە، ئەوەی لێرە باسی دەکەین هەڵە ستراتیژیەکانە، بە کورتی ئەمانەن:

١. شارەزا نەبوون لە پەیوەندیە نێودەوڵەتییەکان و دیاری کردنی پێگەی کورد لە رۆژهەڵاتی ناوەراست و حەساسیەتی سایکس-پیکۆ و پرۆژە جیهانییەکانی(مەبەست ٩ پرۆژەکەیە)لەو ناوچەیە ئیش دەکات .

٢. پالپشت بە خالی(١) و خەملاندنی پێگەی کورد، ئەگەر کورد توانیبێتی (ئەمری واقیع) بۆ عێراقێکی لاوازی قۆلبەستکراو لەبەندی ٧ بسەپێنی ئەوا بەهۆی پشتیوانی نێودەوڵەتی ( بریاری ٦٨٨ و هیلی ٣٦)بوە نەک بەهۆی هیزی خۆی، ئەوا لەو بارودۆخەی رۆژهەلاتی ناوەراست وجیهان ناتوانێ ئەمری واقیع بەرپا بکات بەبێ پشتیوانی زیاتری دەولی ، بۆیە ئەو ریفراندۆمە سەرکەوتوو نابێت ئەگەر ئەمریکاو ولاتانی هاوپەیمانان بەتەواوی پشتیوانی نەبن (هەروەك پیش ریفراندۆم لەتویژینەوەکەمان لە پیش هەموان ئەوەمان ڕاگەیاند) ، دەبوایە پیش ریفراندۆم ئەو پشتیوانیە مسۆگەر بکرێت ، وەک باقی ریفراندۆمەکانی تر هەر هەموی پشتیوانی نیودەولەتی هەبوە ئینجا کردوویانە (وەک لەخواروو زیاتر باس کراوە ) .

٣. شارەزا نەبوون لە گۆڕانکارییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەو دابەشیانەی لەو ناوچە هەیە، روانگەیەکی ڕوونی نەبوو ئاخۆ کام لا لە

خزمەت ستراتیژی بزووتنەوەی کوردستانی هەبوو، بۆیە گەلێ جار دەکەوتە ستراتیژییەک پڕ بوو لە ئەجێندای دژ بە کوردستان.

٤. پالپشت بە خالی(3) لایەنە سونیە عروبی و ناسیۆنالیزمیەکان نابنە پالپشت بۆ مافی چارەنوسی کوردستان  مەگەر بەتاکتیکی وەک ئەوەی سعودیەو ئیمارات و بەجۆریکی تریش تورکیا ،چۆن سەرکردایەتی ئەو حزبەن خراپ هەلخەلەتاند ، بەگشتی پیویست بوو ئەو حزبە کەمتر خۆ بە وولاتانی ئیقلیمی ماندوو بکات و چاوەڕێی ئۆکەی و پشتیوانی(ڕاستەقینە) لە وولاتانی ئیقلیمی بکات .

٥. ئەو دەرفەتە زێڕینەی بۆ کوردستان هاتبوو نەیتوانی بە رێککەوتنی فەرمی و پەیوەندیە دیبلۆماسییەکان و ڕەچاوی یاسای دەولی پڕ بکاتەوە، ئەو رێککەوتنانەی دەشیان کرد( چ لەگەڵ عێراق و دەوروبەر چی لەگەڵ دەرەوە) زۆر لاواز بوو، لاوازترینیان نمونەی رێککەوتنی رۆژی ٢٢ تموز ٢٠١٦پنتاگۆن و عێراق و هەرێم بوو، لە ڕووی ئابووریش ئەو رێککەوتنەی لەگەڵ داناغازو دۆڕاندنەکانی بوو .

٦. کارکردنی سەرکردایەتی (پ.د.ک) لەسەر گۆڕینەوەی پاڵپشتە راستەقینەکانی نێودەوڵەتی بە (پاڵپشتە ساختەکانی) ئیقلیمی.

٧. لە جیاتی بیناکردنەوەی کوردستان هەلسان بە خۆسەرقاڵ کردن بە بینا کردنی عێراق و دەرهێنانی لە بەندی (٧) و دروست کردنەوەی سوپا  و چەک و دەبابەو فرۆکە بۆیان، بەردەوام ئامۆژگاری عێراقیان دەکرد بۆ پابەندی بە

یاساو دەستوورو دامەزراوەیی و یەکبوون... کەچی خۆی لە کوردستان کاری پێچەوانەی ئەوانەی دەکرد.

٨. بڕیاڕوبەلگەنامە دەولیەکانی لا گرنگ نەبوو بەتایبەتی لەگەل نەتەوە یەکگرتوەکان ، چالاکیە دیپلۆماسیەکانی نەکردۆتە ڕیکەوتن وبەلگەنامەو دۆسیەی دەولی ، دوا نامەی وەزیری دەرەوەی ئەمریکاش باشترین نمونەیە کە دەبوە هەنگاوێکی بە نێودەولەتی کردنی دۆزی کورد کەچی باشی لێتێنەگەیشتن و ڕەتیان کردەوە .

9- هەر پالپشت بە خالی(8) بە ووردی پرسی مافی چارەنوس و مافی جیابوونەوەیان بۆ لێك جیانەکرایەوە بە پێی یاساکانی نێودەولەتی ، ئەو تیکەل کردنە بە هەلەی وای بردن ئیستاش سەرسوڕماون لەو بارەیەوە .

٩. ئیعتماد لەسەر هیزی چەکداری و کەچی زۆر لەرزۆک بوە وەک شکستەکانی لە کۆڕی ،دوایش لە ٢٠ی ئاب تا ٢٧ی ئابی ١٩٩٦ ،ئینجا شکستەکانی لە گەڕانەوەی یەکێتی ،ئینجا شکستی لەگەل داعشی لە 7/ئاب/2014 بەدواوە ، دوا شکستیان لەدوای ریفراندۆم تەواوی ناوچەی مادەی ١٤٠ لە خانقین تا سنجار لەدەست چوو ، بۆیە زۆرترین جارپیویستی بە هیزی بیگانە بوە لەدژی لایەنیکی تری کوردی (لەسالی ١٩٨٢ هیزی ئیرانی بۆسەر حدکای ئیران – سالی ١٩٩٢ هیزەکانی تورکیا بۆسەر پەکەکە – سالی ١٩٩٦ هیزەکانی عێراقی بۆسەر یەکیتی – سالی ١٩٩٧ هیزەکانی تورکیا بۆ سەر یەکیتی وپەکەکە ..) .

١٠. له كۆتاييدا كاتێكی زۆر نەگونجاوی بۆ پرسێكی زۆر گرنگ هەڵبژاردو بووە شكستێكی خراپتر لەوەی ساڵی ١٩٧٥، بەڵام دوو هۆی سەرەكی وایكرد كە كاریگەری و ئەنجامی وەك ساڵی ١٩٧٥ نەبێت، یەكیان (پ.د.ك) بە تەنها لە گۆڕەپان نەبوو، دووەمیان بارودۆخی جیهان و ناوچەكە زۆر گۆڕاوەو پێگەی كورد ئاستێكی بەرزی وەرگرتووە...لەبەر گرنگی ئەو خاڵە(كاتی گونجاو و نەگونجاو) هەلوەستەیەكی لەسەر دەكەین لەو برگەیە .

## تێڕوانینی ئەمریكا و پارتی بۆ كاتی ئەنجامدانی ریفراندۆم

كاتی نەگونجاو خاڵێكی زۆر گرنگ بوو لە تێكنەگەیشتن، تائەوساتەش وەك پیویست سەركردایەتی پارتی و ئەوانی تریش لەو (پەرەگرافەدەولیە—بەتایبەتی هی ئەمریكا)نەگەیشتن كەدەیان ووت ئیستا كاتی گونجاو نیە، (پەیمانگای برۆكنزینگ)ی ئەمریكا لەدوا ڕاپۆرتی ئەو خالەی بەووردی ڕوون كردۆتەوە، بە نیسبەت ئیمەی كورد ١٠٠ سال لەمەوبەر كاتی دەولەتی كوردستانی هاتوەو تا ئەو ساتەش ، ئەوكاتانە گونجاون كە ناوەخۆی كوردستان پتەوە وئامادەسازی بۆكراوە لەبەرامبەریشدا بارودۆخی سیاسی وئابوری ویاسایی وسەربازی دەولەتی داگیركەرەكان نالەبار، بەلام هەر وولاتەو كاتەكی گونجاوی خۆی هەیە جیایە لەوەی تر ، سیاسەتی دەولی لە كات وساتی ئیستا پێی چاك نیە دەستكاری رۆژهەلاتی ناوەراست بكریت(دەستكاری سنور) مادام بۆهەر بۆشاییەك هیزی توندڕەو ئامادەبێت پری بكاتەوە ، واهەست دەكریت هەلویستی دەولی ئەوەیە كە حزبەكانی هەریمی كوردستان مقەوەماتی

پڕکردنەوەی بۆشایی رۆژهەلاتی ناوەراستیان نیە ، ڕەنگە ئەو مقەویماتە لە کوردانی رۆژئاوا ببینن .

هەرچی کاتی گونجاوی تایبەتە بە ئەمریکا ئەوا زۆر لایەن دەگرێتەوە، دەیەوێ لەدوای هەلبژاردتی عێراق بزانی چ جۆرە ئارستەیەک سەردەکەوێ چەندە بەلای ئەمریکایە، دەیەوێ هەریمی کوردستان پالپشتی عەبادی بێت (وەک لەدوا ڕاپۆرتی برۆکنیزهاتبوو) ، ئەگەر بەلای پیچەوانەی ئەمریکا بیت ئەو کات بەگونجاوی دەزانی.

ئەوەلەلایەک لەلایەکی تر تائەو ساتەش سەرکردایەتی ئەو حزبەباش لەوە نەگەیشت کە گۆڕینەوەی پەیوەندی (ستراتیژی لەگەل ئەمریکا) بە پەیوەندی (تاکتیکی تورکیا) چەندە زیان بەخش بوو ، زۆر گوێی بە پەیوەندی لەگەل ئەمریکا نەدا ، لەدوا لیدوانی مسعودبارزانی بۆ (NPR )ی ئەمریکی ووتی ئیمە بە پەیوەندیەکانمان دادەچینەوە لەگەل ئەمریکا ،لەکاتێکا بە هەمو پیوەرێکی زانستی سیاسی دەبوایە بلێت بەپەیوەندیەکانمان لەگەل تورکیا دەچینەوە ، لەوەوە بەڕوونی دەردەکەوێ هیشتا سەرکردایەتی ئەو حزبە نازانێت :١- پێگەی خۆی لەکوردستان وپیگەی کوردستان لە جهان چەندە ٢-نازانیت پالپشتی دەولی بۆ کوردستان لە پەیوەندیە ئیقلیمیەکان نایەت ٣- نەیزانیوە ستراتیژی ئەمریکا لەناوچەکە چیەو ئەوەی سەرکردایەتی (پ د ک)کردوویەتی لەسەر ئاستی ناوەوەی کوردستان وئاستی عێراقی و ئاستی رۆژهەلاتی ناوەڕاست ناکۆک بوە لەگەل سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا ، لەوەوە

تێکنەگەیشتنێکی قووڵ لە نێوان گونجانی سەرکردایەتی پارتی و نەگونجانی ئەمریکا  سەری هەڵدا،بەکورتی لە بڕگەی داهاتوو لەسەر ئەو بابەتە دەوەستین .

# تێنەگەیشتن لە سیاسیەتی ئەمریکا

## خاڵە ناکۆکەکانی ئەمریکا و (پ.د.ک)

ئەمریکا کەمتر لەگەل حزب مامەڵەی  هەیە بەفەرمی ، ئەو کارە زیاتر بە (CIA) سپیردراوە ، بەتایبەتی حزبی چەکدار لای ئەمریکا لەلیستی تیرۆر (بۆ ناوەخۆیی) تۆماردەکات ، تانەتوانن سەردانی ئەمریکا بکەن ، بەگشتی لەگەل هەریمی کوردستان مامەڵەی هەیە(بەدەر CIA) ، بەلام نەگەیشتۆتە ئاستی ریکەوتن وبەلگەنامەو دیپلۆماسیەتی فەرمی ، تەنها یەک بەلگەنامە هەیە بریتیە لە ریکەوتنە ٨ مادەییەکەی نیوان (پنتاگۆن وبەغداو هەولیر)ئەویش لە مادەی (٧) دەلیت کاتیەو ماوەی سالیک کۆتایی دیت ، کەواتە بەفەرمی ناتوانین دەست نیشانی ناکۆکیەکانی ئەمریکاو (پ د ک)بکەین بە بەلگەنامە، دەبیت لە چوارچیوەی تویژینەوەو شیکردنەوە بیت ، بەلام ئەو بەیانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکای رۆژی 30 / 10 / 2017 بە ڕوونی پیشوازی لەدەستکیشانەوەی مسعود بارزانی و پیخۆشحال بوونی گوزارشە لەو ناکۆکی وناڕازیانەی ئەمریکا بەرامبەر سەرکردایەتی (پ د ک) ، ئەو بەریەکەوتنانەش زۆرن و کەلەکە بوە ،بەکورتی ئەوەی بنچینەییەکان هەلدەبژێرین:

١- ئەمریکا ڕای لەگەل ئابووری سەربەخۆو ناردنی نەوت نەبووەو پیشبینی ئەوەی کردوە هەریمی کوردستان دەکەویتە قەیران .

٢- پێی باش نەبوە ئەو هەمو پەیوەندیە زیادەڕۆیە لەگەل تورکیا هەیبوە ،وای بەباش زانیوە پەیوەندیەکی نۆرمال بیت .

٣- لەبارەی کوردستانی رۆژئاواش لە هەلویستی (پ د ک )و تورکیا رازی نیە، کە ئەمریکا بە هاوبەشی خۆی دەزانێت لە (پ.د.ك) چاوەڕواندەکرا هەماهەنگی زیاتر بکات لەگەڵ کوردانی رۆژئاوا.

٤- لە تۆمارگای مافی مرۆڤ ورۆژنامەنوس و سەروەری یاساو شەفافیەت رازی نەبوە .

٥- داوای کردوە باسی دەولەتی کوردستان نەکرێ بەلام ئیشی بۆ بکرێت ، لەوەش پابەند نەبوون .

٦- بەپێی ڕێکەوتنی نیوان( پنتاگۆن وهەولیروبەغدای ٢٢/تموز/٢٠١٦) کە پیکهاتوە لە ٨ مادە ، لەمادەی ٦ی ئەو ریکەوتنە (دەبیت هیزی پیشمەرگە بکشیتەوە) کەچی مسعودبارزانی دەیووت ناکشیینەوە ،دوای لەناوچەکانی تریش کشایەوە .

٧- بۆ ئەمریکا سەرکەوتنی ئەزمونی عێراق زۆر گرنگە ، بەتایبەتی ئارامی و سەقامگیریەکەی ، بۆیەش لە پیناو ئەو سەقامگیریەی چاوپۆشی لە هەندێ پیشیلکاری دەکات ، بەهەمان هاوکیشە سەقامگیری کوردستانیشی لا گرنگە، چاوپۆشی زۆر پیشیلکاری لە پیناو کردوە لەلایەن هەردوو دەسەلاتی بەغداو هەولیر، بەلام لەکۆتاییدا ئەگەر (ناسەقامگیری)

هەریمی کوردستان وبەغدا تیکگیرا لایەنگری سەقامگیری عێراق دەکات یەکەم جار، ئەوەش خیلافیکە بەڕێوەیەو ماناکەشی روونە .

٨- دوا ناکۆکی ڕاستەوخۆ پرسی ریفراندۆم بووزۆر نارازی بوو پێی وایە کاتی نەهاتوە ، پیشبینی وئەنجامەخراپەکانی بەو سەرکردایەتیە ووتوەو بەگوێی ئەوانیش نەکراو شکستە گەورەکان لێرەوە دەست پێدەکات .

**پەیوەندی کورد و ئەمریکا بەرەو کێ؟**

ئەوەی ئێستا سەرکردایەتی (پ.د.ك)دەڵێت ئەمریکا دیسان پشتی لە کورد کردو بێوەفا بوو وانیە، هەروەك پێش ریفراندۆمیش کە دەیان ووت ئەمریکا لایەنگری دەوڵەتی کوردستان و ڕیفراندۆمە ئەوەش وانەبوو، هەردوو ڕوانگەی چەوتە لە تێنەگەیشتنی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا دێت بۆ ناوچەکە، لەناوچەکەش سەبارەت بە پەیوەندی کورد و ئەمریکا، کورتەیەك لەو سیاسەتە باس دەکەین :

خودی ئەمریکا لەڕێکەوتنەکانی سایکس بیکۆی 1916 و سەرەنجامەکانی لەدابەش کردنی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ئینتدابا بەشدارنەبووە، بەریتانیا و فرنسا هەوڵیان دا چاوی بنوسێنن و ئەرمینیای پی بدەن وەك ئینتداب، بەڵام دوای ئەمریکا بۆی دەرکەوت ئەوە فێلی لیّ دەکەن، دەیانەویّ بیکەنە سەنگەر لەپیش بزوتنەوەی بەلشەفی شیوعی لەسەردەمی لینین و روسیا، ئەمریکا لەدژی ئەوهەنگاوانەی بەریتانی وهاوپەیمانان وەستا، لەسالی1918لەلایەن ویلسۆنی سەرۆکیەوە 14بنەماکەی بۆ ئەو مەبەستە بڵاوکردەوە، لەدوای سالی 1919لیژنەی (کنگ ـ کراینی) بۆ ناوچەی

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نارد وداوای (سیاسه الباب المفتوح) کرد، پێشنیاریشی کرد هەمو ئەو ناوچانەی لە عوسمانی جیاکراوە(بەکوردستانیشەوە) بخرێتە سەر مومتەلەکاتی (عصبه الامم)، بەڵام ئەو سیاسەتەی باش بۆ نەچوە سەر ناچار کەوتە دوای سیاسەتی دابەش کردنەکانی بەریتانیاو فرنسا ، لەدوا ڕاپۆرتی لیژنەی (کنگ – کراین) داکۆکی لەو وولاتانە کرد کەتازە لەلایەن بریتانیاو فرنسا دروست کرابوون ، لەڕاپۆرتەکە ئاماژە بە یەکپارچەی خاکی عێراق دەکات ،لەو کاتیەوە سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر یەکپارچەی خاکی عێراق نەگۆڕاوە ، هەر لەسەر ئەو بنچینەش پەیوەندیەکانی ئەمریکاو کورد لەباش ترین دۆخی ئەوەبوە (کوردلە دۆزەخ دەردەهێنی بەلام نایخاتە بەهەشت)، هەر یەکەم پەیوەندی کوردو ئەمریکالەو لیژنەیە(کنگ- کراین) بەدی دەکرێ کە هاتبون لەکوردستان لەگەل نوێنەرانی کورد دانیشتبون، لەو کاتیەوە تا نیوەی سەدەی بیستەم ڕۆلێکی وای لەناوچەکە نەبوەو لەگەل کوردیش بەو شێوەیە نەبوە، لەو کاتیەوە دەتوانین بڵێین بوە میراتگری بەریتانیا لەناوچەکە تاکۆتایی سەدەی بیستەم و رووخانی یەکێتی سۆڤیەت(واتە لە نێوان جەنگی سارد) هەلوێستی ئەمریکا (وەك لەبەڵگەنامەنهێنی وئاشکراکان دەردەکەوێ)نەیویستوەخۆ لەکێشەی کورد بگلێنی ، زیاتر بنەماکانی ئیستعماری وسایکس پیکۆی لەناوچەکە پیادەکردوە، لەهەمو بەڵگەنامەو چالاکیە دیپلۆماسیە ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆکان دەرکەوتوە: هەرگیز نەگەیشتە ئەو رادەیەی قەناعەتی ئەمریکا بێت کە میللەتی کورد شایستەی مافی چارەنوسە، بەڵام کەدەکەوێتە لێواری دۆزەخ بەهانات

دێت، دەرت دێنێت لە دۆزەخ بەڵام ناتخاتە بەهەشت، ئەو جۆرە سیاسەتەو تێنەگەیشتنی کورد لێی شکستی 1975ی لێ هاتە دی .

یەکەم گۆڕانکاری بەسەر سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بەکورد لەدوای سالی 1979 لەدوای سەرکەوتنی شۆرشی ئیران بەسەرۆکایەتی أ خمینی دێت، تارادەیەك کوردکەوتە نێو حیساباتی ستراتیژی، دوای ئەوەی ئیسلامیەکان لە تورکیاش سەرکەوتن ولەسالی 2003نەبونە یارمەتیدەری هێزەکانی ئەمریکا لە کاتی هێرشیان بۆسەر عێراق جارێکی تر تەکانێك بە پەیوەندی کوردو ئەمریکا درابۆ ئاستێکی بەرز، لەگەل ڕووخانی بەعس لە عێراق وگەیشتنە دەسەڵاتی ئیسلامیەکان لەعێراق دووبارە تەکانێکی گەورەتربەوپەیوەندیە درا، کەواتە ئەو پەیوەندیە بۆ کورد لە دۆڕاندنی دۆستی فەرمی ئەمریکا هاتوە، واتە دەست بەکاربونی مەدرەسەیەکی ناتەبا لەگەل ئەمریکا وای کردوە ئەو پەیوەندیە زیادەیە دروست بێت، لە 2002ەوە دروشمی جەنگی (یان لەگەلمی یان دژمی )لەلایەن ج بۆشەوە جاڕدرا، شکستیەکانی لە ئەفغانستان و لە عێراق و مانەوەی دەوڵەتی ئیران وەك خۆی بوە هۆی شکستی ئەمریکاوهاتنی ئۆباما، ئیتر واز لەو هەنگاوە هینرا، ئەگینابەردەوامی لەو سیاسەتە چەوتەی ئەمریکا لەقازانجی کورد بوو، مادام تێکدانی نەخشەی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو بەدیوێکی تر کاتێ ئەمریکا پابەندە بە پرۆژەکانی چاکسازی رۆژهەلاتی ناوەڕاست (پرۆژەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی گەورەی ئەمریکی لە 2004ز - مبادره الشراکه کۆلن پاول –امریکا - 2002 ز۔ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی تازە-ووتاری ج بۆشی کوڕ لە 2003 /11/6ز )ئەوا بۆکورد باش نیە ،بەلام کاتێك لادەداو پابەند دەبێت بە گەلالەکانی ( بریجنسکی — برنارد لویس –- ئەلان گالون) بۆ کورد باشترە ،

واتە: 1 ـ پەیوەندی کوردو ئەمریکا سروشتی نیە، لەو کاتانە سوودمەند دەبێ کە دۆخی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناسروشتیە، ستاندەر بونەوەی مەترسێدارەبۆکورد، ڕەنگە پەیوەندیە بالاکان هەتا سەری نەبێ ببتەوە پەیوەندی نۆرمال 2 ـ بونی ئەو هێزە ئیسلامیانە(لە تورکیاو عێراق وئیران) بوویتە هۆی ئەو پەیوەندیە باشەو و جەژنی بزوتنەوەی کوردایەتیە 3 ـ ئەمریکا چاکەی لەگەل کورد کردوە بە ڕووخاندنی بەعس ولادان لەو ستراتیژەی نزیکەی سەدەیەك بوو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی بەستبۆوە.
لەوەی سەروو دەردەکەوێ ئەمریکا نایەت کوردستانت بۆ رزگار بکا، سێبەرێکی گشتیت بۆ دروست دەکا ئەگەر بەرنامەت ووردو زانستی بێت ئەوا سودمەند دەبی، ئەگینا پێچەوانە دەبێت، لەسەر ئەو بنچینەیە سەرەنجامێکی مەنتیقیە کە ئەمریکابگەڕێتەوە سەر پەیوەندی خۆیی و وڵاتانی ناوچەکە، ئەوەش زیاتر بەوە دەبێ ئەگەر (عێراق وتورکیا وئیران) لەو بنەما ئیسلامیانەیان هەلگەڕێنەوە .

هەروەك بینیمان لەڕووخانی بەعس ئەمریکا چاکەی پێشکەشی هەمولایەك کرد (میلەتانی عێراق، کویت، تەنانەت بۆ ئێران و قاعیدەش سودیان لە رووخانی صدام بینی)، بەڵام  چاکەکەی تەواو نەکرد لەگەل کورد، هەربۆیەش لەو فەترەیەی کە ڕاستەوخۆ خۆی حوکمی عێراقی کرد(گارنەر وبریمەر)، یاخود لەڕێ ی دۆستەکانی، کەیەکەم سەرۆك کۆمار غازی یاوەر و سەرۆك وەزیران ئەیاد علاوی کێشەکانی کوردی چارەسەر دەکرد، بەپیچەوانەوە دەستکەوتیکی وا لەوانەی سەروو بۆکورد لەو دوو فەترەیە نەهاتەدی، بەڵکو لەدواتر هاتەدی، لەڕاستیدا بنەچەی کێشەی

مادەی140 لە بڕیاڕی دژە فڕینی سەرووی هێڵی36 دێت، هەرچەندە ئەوکاتی پیاوەتیەکی گەورە بوو لەگەڵ کوردستانیان کرا، بەڵام ڕاستیەکەی سەرووی هێڵی 34بوایە ئەو کێشەیە ئێستا نەدەبوو، .. بۆیە ئەمریکاو ڕۆژ ئاوا خاوەنی ئەو دەستکەوتانەی ئێستا نین بۆ کورد بەتەنها ، هەمو ئەو سیاسەتە ئالۆزەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست لەلایەن سەرکردایەتی (پ د ك)و زۆربەی ئەوانی تریش مەفهوم نەبوو ، بۆیە نەیان زانی مامەلەی ستراتیژی لەگەل بکەن ،بەڕای زۆربەی شارەزایانی ستراتیجی نامەکەی (تیلەرسۆن)بۆ کاك مسعود گوزارش بوو لە لوتکەی پەیوەندی کوردو ئەمریکا ، لە 100 سالی ڕابووردوو دەرفەتیکی وانەهاتبوو واش چاوەڕوان ناکرێت بەو زوانە ببێتەوە ، بنەمای گرنگی تێدابوو ،بەلام زێڕ لای زێڕینگەر بەنرخە ، سەرکردایەتی ریفراندۆم نەیزانی ئەو بەلێنانەی لەو نامەیە هاتوە چەندە گرنگن ، لە ئیستاشدا سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر کورد زۆر نەگۆڕاوە وەك (کاك مسعودبارزانی )دەلیت ، بەلکو سیاسەتی بەرامبەر خۆی و سەرکردە کلاسیکیەکان گۆڕاوە ، پێی وایە سەرکردایەتی کلاسیکی هەردوو حزبی دەسەلاتی کوردی دەبێت بگۆڕدرێت ، بۆیە بە فەرمی پیشوازی لە دەست لەکارکیشانەوەی کاك مسعود کردو لایەنگری سەرکردەگەنجەکانی کرد(نیچیرڤان وقوباد) ، ئەوەی ڕوویدا لە 3 بەیانەکەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا هاتبوو، لەهەمویان ڕوون تر ئەو بەیانەی کە لە 2017/9/15 دەرچوە باس لەوە دەکات کە کردنی ریفراندۆم لە ناوچە دابڕێنراوەکان وکەرکوك (استفزازیە)،ئەوەش ئاگاداری و

ئینزاریکی زۆر توندە ، ئاماژەی ڕوونە بۆلەدەستدانی پشتیوانی نیودەولەتی و ئەو کارەساتەی بەسەر کەرکوك وناوچە دابڕێنراوەکان هات .

لەدوا بەیانی وەزارەتی دەرەوەی جارێکی تر دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە ئەمریکا واز لەدۆستایەتی دیرینەی خۆی ناهێنێ لەگەل میلەتی کورد ، تەنانەت دەلێت کوردستانێکی بەهێزمان دەوێت لە عێراقیکی بەهێز ، ئەوەش ڕوونە مانای وایە ئەو سزایە میلەتی کورد ناگرێتەوە هەتا حزبەکانیش ناگریتەوە ،تەنها سەرکردایەتی حزبەکان دەگرێتەوە ، لەوانیش سەرکردایەتی ئەو حزبانەی ریفراندۆمیان کرد ،بە پلەی یەك سەرکردایەتی(پ.د.ك)، بەپلەی دوو مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ك) ،بەپلەیەکی دووریش سەرکردایەتی یەکگرتوو ،بەلام مامەلەی ئاساییە لەگەل سەرکردایەتی گۆڕان وکۆمەل و هاوپەیمانی و بەشیکی فراوانی (ی ن ك) ، واپیدەچی لەکۆتاییدا کەمێك مامەلە لەگەل سەرکردایەتی پارتی بکات کە زۆر لایەنگری ریفراندۆم نەبووبن ، کەواتە ئەگەرچی گورزیکی گەورە بەر پەیوەندی ئەمریکاو کوردستان کەوت لەسەر دەستی ئەو سەرکردایەتیە بەلام هیشتا ئاسۆ ڕوونە بۆ چاکردنەوەی ئەو پەیوەندیە ئەگەر ئەو سەرکردایەتیە بە ڕاستی کەمێك دوور بکەونەو بوار بۆ سەرکردایەتی تازەیان بڕەخسێنن، ئەو سەرکردایەتیە نوێیە نابێت تێگەیشتنی بە ئاوەژووی بێت وەك سەرکردایەتی کلاسیکی، دەبێت مامەڵەی وەك نەشتەرگەری دڵ لەگەڵ پەیوەندیە دەولیەکان بکات، کە ئەمریکا دەلێت (کوردستانێکی بەهێز) مانای وا نیە وەزارەتی ناوخۆو ئاسایش و زیندانی بەهیز بکەی ،مەبەستی ئەوەیە دام ودەزگا بینا بکرێت

،یاسا سەروەر بێت ، سێ دەسەلاتەکە لێك جیا بکرێتەوە ، حزب چەکداری نەبێت ،  دەست گۆڕی دەسەلات ودیموکراسی بەرجەستە بێت ،مافی مرۆڤ وژن ورۆژنامەنوسی ئازاد هەبێت ،شەفافیەت لە ئیدارەو دارایی هەبێت ، دەست بە نەشونوما کردنی ئابووری وتەکنۆلۆجیا بکەیت .

# بەراوردی هەڵە (سەرچیغی لە سیاسەت)

لە سەرەتای پرسی ریفراندۆمەوە تا ئەوساتە واهەست دەکریت (هۆشیاری یاسای نیودەولەتی )لەبارەی ڕیفراندۆم زۆر لاوازە لەلایەن سەرکردایەتی ئەو حزبە( هەروەها هەندێ مەکتەب سیاسی یەکیتی و سەرکردەی یەکگرتوو و.. حزبەکانی تریش کە بەگەری کەوتبوون) ، بەراوردی نا لۆجیکیان دەهینایەوە ،کاک مسعود دەیووت لە پرسی فیدرالیش نیودەولەتی دژمان بوون کەچی کردمانە ئەمری واقیع، ئەو کاتیش (پ د ک) بەهەلەداچووبوو کە دەیان ووت سیاسەی دەولی لەگەل ئۆتۆنۆمیە نەک فیدرالی ، ئاوانەبوەو ئەمریکاو بیانیەکان وهەتا ئۆپۆزیسۆنی عێراقیش دژی فیدرالی نەبوو تەنها وولاتانی ئیقلیمی وعێراق دژ بوون،بۆیەش (پ د ک) دواکەوت لە گۆڕینی ئۆتۆنۆمی بۆ فیدرالی، بە بڕیاڕی ژ:٣ی کۆنگرەی (١١)ی (پ.د.ک) سالی ١٩٩٣ فیدرالی کرا ئامانج.

دەبێ ئاگادار بین لە ١٠٠ سالی ڕابووردوو بە دەست وبازووی کوردستانی نەمانتوانیە (ئەمری واقیع) فەرز بکەین مەگەر بڕیاری نێودەولەتی لەگەل بووبێت، لەدوای ڕاپەرینی 1991 هەردوو بڕیاری ٩٨٦ و ٦٨٨ و دوایش هێلی ٣٦ لە (عملیة توفیرالراحە - Provide comfort operation ) وولاتانی هاوپەیمانی، لەوێوە دەسەلاتی( ئەمری واقیع) دروست بوو ، دوای لە مادەی (١ و١٢٧ ) ی دەستوری نوێی عێراق تۆمار کرا ، زیاتر لە ٦٠ جار ناوی دەولەتی عێراق بە (اتحادی-فیدرالی)هاتوە ، کۆتایی بە دەسەلاتی دیفاکتۆی کوردستان هێنرا بوە دەسەلاتی دیگۆرایی (یاسایی)

به فیدرالیشه‌وه که له ١٩٩٢/١٠/٤ جاردرا له په‌رله‌مانی کوردستان ، جاڕدانی فیدرالی یه‌کلایه‌نانه زۆر جیایه له گه‌ل جاڕدانی سه‌ربه‌خۆیی ،ئه‌وه‌ی یه‌که‌م تایبه‌ته به‌ده‌سه‌لاتی ناوخۆیی عێراق (جاروایه پێی ده‌ووتری مافی چاره‌نوسی ناوه‌کی) پێویستی به (یاسای ده‌ولی و سیاسه‌تی ده‌ولی و علاقات ده‌ولی) نیه، له ناوه‌خۆی عێراقی زه‌مینه‌یه‌کی یاسایی و سیاسیشی هه‌بوو بۆ فیدرالی ، دوای سالی ١٩٧٤ حکومه‌تی عێراق قایل بوو بۆ کوردستان (ئه‌نجومه‌نی یاسادانان) هه‌بێت، دوایی به یاسای ژ:٥٦ی سالی ١٩٨٠ ریکی خسته‌وه، دوایی ئۆپۆزیسۆنی عێراقی ره‌زامه‌ندی له‌سه‌ر فیدرالی دا ،دوای رووخانی عێراق گه‌یشته ده‌ستور(ماده‌ی ١١٧ ) ،هه‌تا فتوای سیستانی مه‌رجه‌عی بالای شیعه‌ی عێراق (ده‌قی فتواکه‌ی ٢٤ژی الحجه١ ٤٢٤)سه‌باره‌ت به فیدرالی که له وه‌سیقه رقم٥٣ ده‌رچوه ، به‌لام پرسی ریفراندۆم زۆر ئالۆزه ، هه‌لوه‌شاندنه‌وه‌ی سیاده‌ی ده‌وله‌تیکه (ئه‌گه‌ر چی ئه‌و ده‌وڵه‌ته دروستکراویشه) به‌ڵام هه‌نگاوی یاسایی بۆ هاویشتراوه : به پێی ماده‌ی (٩٤ و ١٣٢)ی سیڤه‌ری (١٩٢٠) له عوسمانی جیا کرایه‌وه،به پێی ماده‌ی ٢٧ یش سنوری دیاری کرا ، دوایی به پێی ماده‌ی ٢٢ی به‌ندی یه‌کی به‌ڵگه‌نامه‌ی (کۆمه‌ڵه‌ی گه‌لان) هه‌روه‌ها له بڕگه‌ی(٨)ی ماده‌ی (١٥) به‌ڵگه‌نامه‌که سیاده‌ی دروست کرا (١٩٢١)،دوای ٥ سال ئینجا سیاده‌ی کوردستانیشی خراسه‌ر به پێی جه‌لسه‌ی ژ:٣٧ی (کۆمه‌ڵه‌ی گه‌لان)رۆژی ١٩٢٥/١٢/١٦ ، ئینجا نوسراوی ژ:٤/٣٣٣٠ ی برسی کۆکس ،لةسةردةمی نةتةوة یةکطرتوةکانیش له برگه‌ی (٧)ی ماده‌ی (٢)ی میساقی نه‌ته‌وه یه‌کگرتوه‌کان ئةو سیادةیة تؤمارکرا...، هه‌مویان ده‌بنه

پالپشت بۆ مادەی(١)ی دەستوری ئیستای عێراق کەدەلێت : (جمهوريه العراق دولهٌ اتحاديه واحده مستقلهٌ ذات سياده كامله ) ، ئەوە سەربردەی سیادەی عێراقە ، ئەو بەراوردە چەوتەی سەرکردایەتی کورد (لە نێوان فیدرالی و ریفراندۆمی سەربەخۆیی) بوە بنچینەی تیرۆوانینیکی چەوت بۆ ئەو پرسە گرنگەو وابەهەلە داچوون  هیچ نمونەیەک لەوە گونجاو ترنیە بۆ مەبدەئی(بۆ سمیل چوون ریشیشیان لەسەر دانا) زیاتر ڕێڕەوی ئەزمونی تامیل لە سریلانکا و ئەزمونەکانی چیچان وقەوقازی وەرگرت .

بەکورتی سەپاندنی (ئەمری واقیع) لەسەر ئاستی دەولی جارێ لە ئاستی تواناى کورد نیە ، ئەو ئەزمونانەی سەپاندنی ئەمری واقیع هێزی دەوێت ، قوبرس کردی تورکیای لە پشت بوە ،قرم کردی روسیای لە پشت بوە، بەهەمان شێوە ئۆسیتا واخەریکە ریفراندۆم دەکا بۆجیابوونەوە لە جۆرجیا روسیای لەپشتە ،..،کۆسۆڤا کردی هەمو ناتۆ و نەتەوە یەکگرتوەکانی لە پشت بوو ،...،کە ووتت(ئەمری واقیع) یەکسەر دەبێت تەماشای هیزی پشتیوان بکەی ، ئەو هێزە بۆ کوردستان جارێ نیەو سەرکردایەتی کوردیش لەو سات وکاتانەی هەبوە وەک دەرفەت لەدەستیان چواندوە ، بۆ ئیستا ئەو هیزە پشتیوانە نیەو کەمتریش کاری لەسەر کراوە بۆیە سەپاندنی ئەمری واقیع ناکرێت و سەرکەوتوو نیە مەترسی پیچەوانەی هەیە وەک ڕوویدا .

لەکۆتاییدا  واپێدەچی هێشتا ڕوانگەیەکی یاسایی روون نەبیت بەرامبەر ریفراندۆم لەلایەن سەرکردایەتی کوردستان وئەوحزبەش، عادەتەن

ریفراندۆمێک به فلتەری یاسایی (هەریم وعێراق ودەولی)ڕەت نەبێت دەووترێت ریفراندۆمی بێئامانج ،عەبەسی ، پووچی یاسایی ... لەراستیدا ریفراندۆمی ٢٠٠٥ و هی ئیستا به پێی یاسای نیو دەولەتی یەک خوێندنەوەی بۆدەکری ئەویش یەکلایەنی ... ، ئەوەی ٢٠٠٥ چارەنوسی بەهیز تر بوو ئەگەر کاری لەسەر بکرابایه چونکه عێراق هەم لاواز بوو هەم له بەندی حەوت زیندانی کرابوو (ناقص السیادە)بوو هەم کۆدەنگیەکی زیاتری لەسەر بوو ، کەچی ئەوکاتی سەرکردایەتی (پ د ك) زۆر لاگیری نەبوو ،کاك مسعود له گفتوگۆیەکی لەگەل (لاریپۆپليك)ی رۆژی 2005/8/24 دان بەوە دەنێت ودەلێت: 96%ی کورد داوای جیابونەوەیان له عێراق کرد ئێمه وامان کرد جیا نەبنەوە. **بۆ زیاتر لەبارەی ریفراندۆم بروانەتوێژینەوەکانی ستاندەر :**

1- ڕێفراندۆمی کوردستان بەپێی یاسای نێودەولەتی.

2- الملف القانونی لحق تقریر المصیر لشعب کوردستان وفق قوانین الدولیه، هەروەها (له بۆردی مافی چارەنوس و لەدەزگای ستاندەر و خەڵکی تری قانونی) نەخشه رێگەی قانونی و زانستی وورد دیاری کراوە بۆ ریفراندۆمێکی سەرکەوتوو گەیانراوەته دەستی سەرکردایەتی، دیاری کراوە چی پێویسته له ناوەخۆ بکرێ ئینجا لەگەڵ عێراق و دوایش لەگەڵ نەتەوە یەکگرتوەکان، تیایدا دیاری کراوە ئەگەر بەهەڵەیی بکرێت کاردانەوەی دەولی و هەرێمی خراپی دەبێت.

# شکستە ڕوونەکانی ئەو حزبە لەدوای ڕیفراندۆم

لەبەرئەوەی ئەو پرۆژەیە تایبەت بوو بەو حزبەو سەرۆکەکەی هەروەک خۆشی لەووتارەکانی ووتی ئەگەر شکستەک هات ئەوا (من بەرپرسیارم وئامادەم ملم لەسەر دانیم)، بۆیە بەشی زۆری سەرکەوتن وشکست هەر بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە ،حزبەکانی تر هەر بەگەر کەوتبوون .

لە ئەزمونە سەرکەوتوەکانی ڕیفراندۆم نێوانی ریفراندۆم وسەربەخۆیی و وجاڕدانی دەولەت چەندقۆناغیکە ( جیابوونەوە-–سیادە - سەربەخۆیی - دەولەت) دەست پێدەکات، کەچی لەکوردستان دوای ریفراندۆم بوە شکست وپشیمان بوونەوەو سڕ کردنی ڕێفراندۆم ودانوستان لەسەر چۆنیەتی بەدەستەوەدانی ناوچە دابڕێنراوەکان ...

لە پیش ریفراندۆمیش لیدوانی بەرپرسان ئەوە بوو دەلین ئەو ریفراندۆمە یەکسەر بۆ دەولەت نیە، باسی سەربەخۆیی و جیابونەوەش ناکەن ، دەلێن چەندین سالی تر دانوستان ئینجا ڕەنگە بگەینە ئەنجامیک .. ئەو بۆچونە سەرلەبەری چەوتە ، ناکرێ میللەت بەیاسا بخەیە ریفرانۆدم و هەموو میللەت داوای سەربەخۆیی بکەن ئینجا ئەو داوایە بخەیتە گفتوگۆ و سازش و دانوستان و بۆ کەمتر لەوەی میلەت داوای کردوە ، لەهیچ شوێنێکی جیهان ئەوە نەکراوە، چونکە ئەوجۆرە ڕێفرۆندامە ئیلزامیە(Mandatory referendum ) نەک (Optional referendum) ، هەردەم گفتوگۆ و سازش و دانوستان پێش ریفراندۆمە، کە گەیشتە

ریفراندۆم دەبێت رێز لە ڕای میللەت بگیرێ، پێویستە ئەگەر دەولەتیش ڕانەگەیەنی ئەوا یەکسەرسەربەخۆیی ڕابگەیەنی و جیابیەوە ، هەمو ریفراندۆمەکان یەکسەر سەربەخۆیی راگەیەنرایە ،بەلام هەندێکیان بوون بەدەولەتیان دوا دەکەوت بەهۆی هەلگیرسانی شەڕ،ئەوانە نمونەکانن :

١- جەزائیر - بەپێی رێککەوتنی ئیڤیان لە نێوان فرنساو بەرەی رزگاری جزائر لە ١٩٦٢/٠٣/١٩ بڕیاری ڕاپرسی درا، لە یۆلیۆی ١٩٦٢ ڕاپرسی ئەنجام درا. لە ٩٩.٧% دەنگی بە بەڵی دا، لە هەمان مانگ سەربەخۆیی راگەیاندرا .

٢- ئەریتریا - ریفراندۆم لە مانگی ٤ی١٩٩٣ ئەنجام درا. بە پێی ڕیکەوتنی ئەدیس ئەبابا ، رێژەی ٩٩.٨% دەنگی بە بەڵێ دا، هەر ئەو شەوە سەربەخۆیی ڕاگەیەنرا ، لە مانگی ١٩٩٣/٥ سەربەخۆیی و دەولەتیان راگەیاند ، واتە یەکسەر سەربەخۆیی و جیابونەوە بوو ، یەک مانگ نێوانی دەولەت وریفراندۆم بوە .

٣- خواروی سودان -لە ٢٠٠٥ ەوە بریاری ژ: ١٥٩٠ مادە ٤ لەنەتەوە یەکگرتوەکان دەرچوو بۆ ریفراندۆمی خوارووی سودان ، بوە بنچینەی ڕێکەوتنی نێوان حکومەتی سوودان و حەرەکەی شەعبی(مۆرکرا لە نیوان جۆن گەرەنگ وعلی عوسمان تەها لە ١/٩ /٢٠٠٥ )لە ژێر چاودێری( الهیئە الدولیە للتنمیە - Intergovernmental Authority on Development) و (إیگاد- IGAD) و (مجموعة من الدول المانحة) ، بڕگەی (2 و ە) لە بەندی (٣) پرۆتۆکۆلی (مشاکۆس ٢٠٠٢ز) تیایدا ریفراندۆم لە ٢/٠١/٠٩ ٠١١ بکرێت ، ئینجا لە مادەی (٢٢٥)ی دەستوری سودانیش ئەو ڕیکەوتنە تۆمارکرا،

لەکاتی خۆی ئەنجام درا، رێژەی دەنگی بەڵێ ٩٨% بوو، یەکسەر جیابوونەوەو سەربەخۆییان ڕاگەیاند ئینجا سیادە، لە ٢٠١١/٩/٠٩ دەوڵەتیان راگەیاند.

٤- تەیمووری رۆژهەڵات- لە ١٩٩٩/٨/٣٠ ریفرادۆمەکە کرا، لە ٧٨.٥% دەنگی بە جیابوونەوە دا، یەکسەر سەربەخۆییان ڕاگەیاند ، بوە شەڕ دوای هاتنی هیزی دەولی (قوە حفظ السلام) نێردەی نەتەوە یەکگرتوەکان (سیرجیو دی میللۆ) وەک حاکمی کاتی دەستبەکار بوولە دیسێمبەری ١٩٩٩ تا ئایاری ٢٠٠٢، لەمانگی ١٠/ ١٩٩٩ پەرلەمانی ئەندۆنیسیا ئەنجامی ریفراندۆمەکەی قەبوول کرد، ئینجا دەوڵەتیان راگەیاند. لە ٢٧/مایۆ/٢٠٠٢ بووە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

٥- کۆسۆڤۆ - لە تەموزی ١٩٩٠ راپرسی ئەنجام درا، بەیەکلایەنی (واتە بیرەزامەندی سربیا)ریفراندۆم کراو جاڕی جیابوونەوەیان دا لە سربیا ،بەلام جاڕی دەولەتی نەدا ، لە ١٩٩٢ سەرۆکیان هەڵبژارد بەڵام کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دانی پێدا نەنا. لە ١٩٩٨ شەر دروست بوو، کۆمەڵگای نێودەوڵەتی تەدەخولی کرد، بەپێی بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایش (١٢٤٤) رۆژی ١٩٩٩/٢/١٧لەژێر سەرپەرشتی دەولی(مجموعة المراقبة الدولية) مایەوە، هاشم تانجی سەرۆکی کۆسۆڤا رۆژێک پیش هەلبژاردن ووتی رۆژی دوای هەلبژاردن بە (بەلێ)یەکسەر سەربەخۆیی ڕادەگەیەنین ، لە ٢٠٠٨/٢/١٧ پەرلەمانی کۆسۆڤا سەربەخۆیی راگەیاند، ئەو کاتە دەولەتیان ڕاگەیاند کە سربیا کەوتە ژێر بەندی (٧)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان ،

هاوپەیمانان پشتیان گرت و ریفراندۆمە یەکلایەنیەکە بەو هۆیە سەرکەوتوو بوو ، سربیا قایل نەبوو دۆسیەکە چوە لای دادگای لاهای ناچار ئەو پشتیوانیە دەولیە تەنها توانی لە دادگای لاهای (محكمه العدل الدوليه) لە ٢٠١٠/٧/٢٢ یەکلا بکرێتەوە، بەو شێوەیەی خوارەوە بوو:

بەپێی بڕیاڕی ( الجمعيه العامه –خولی:٦٤ بند:٧٧ ٨سبتمبر٢٠١٠) دۆسیەی کۆسۆڤاچوە دادگای لاهای ئەوەش دەقی وەلامی دادگایە :( اعلن هيساشي اوادا رئيس محكمه العدل الدوليه فی قصر السلام فی لاهای إن المحكمه "خلێت إلی ڕن " إعلان الاستقلال فی ١٧ شباط/فبراير ٢٠٠٨ لم ينتهك القانون الدولی العام") ، لە ١٠/ سبتمبر/٢٠١٢ (مجموعه المراقبه الدوليه)کۆتاییان بەکارەکانی خۆیان هێنا و بەومانایەی سەربەخۆیی وسیادەی کۆسۆڤا تەواو بوو ،بەلام تا ئەو ساتەش نەبۆتە ئەندام لە نەتەوەیەکگرتوەکان بەهۆی ئەو هەلویستەی سربیا .

٤- بیابانی رۆژئاوا وفلستین و تایوان و ... کێشەی (بیابانی رۆژئاوا - سەحرای غەربی)زۆر تایبەتە چونکە شێوەیەکە لە (مافی چارەنوس و مافی جیابونەوە) ،لەژێر دەستی ئیسپانیا بوو ،لەسالی ١٩٧٦ جاڕی سەربەخۆیی داوە بەلام یەکلایەنە سەرکەوتوو نەبوو زۆر ئالۆزتری کرد ،مەغریب و مۆریتانیاش داوایان دەکردەوە ،بەرەی پۆلیساریۆش داوای سەربەخۆیی دەکرد ،ئەو دۆسیەیە چوە دادگای لاهای ،ئەویش وەلامی بەوە دایەوە کە شمولی بڕیاڕی ١٥١٤ دەکات (واتە سەربەخۆیی) مادام (شعب)ە لەدۆسیەی نەتەوەیەکگرتوەکان ،ئیسپانیا ریکەوت لەگەل

پۆلیساریۆ له سالی ١٩٧٥ کەبەناوی ریکەوتنی مەدرید ناوزەد دەکرێت ،کشایەوە ، بەپێی بریاری ١٥١٤ نەتەوە یەکگرتوەکان ڕێی ڕیفرۆندامی پێداوە ، دوای ئەوەی زیاتر لە ٧٠ وولاتیش دانیان پێدا هێنا ئینجا شای مەغرییبیش هاتە ڕایێ ،بەلام هەروا مەغریب کێشەی بۆ دروست دەکا نەکراوە .

تایوان تا ئەو ساتە ١٥ جار داوای بە ئەندام بوونی کردوە رەزامەندی بۆنەکراوە ،کاتی خۆشی ئەو ئەندام بوو نەک چین ،فەلەستین لە ١٥ی سپتمبری ١٩٨٨ ەوە جاری دەولەتی داوە کەچی تا ئیستا هەر جاڕدانە. هەر بۆ زانینیش لەمادەی ٦٤ی سیڤەر ڕەهەندی ریفرۆندۆم بۆ کوردستان هاتوة ،بەلام بە ئاڕستەیەکی تر بردرا.

**ئەزمونی زیاتر لەو بارەیەوە:**

١- وڵاتی ئیستۆنیا- رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ٣ / ٣ / ١٩٩١ رۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ١٧ / ٩ / ١٩٩١، رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی ٩ /١٩٩١ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان شەش مانگ.

٢- وڵاتی لاتیڤیا - رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ٣ / ٣ / ١٩٩١ رۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ١٧ / ٩ / ١٩٩١ رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی ٩ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان شەش مانگ .

٣- وڵاتی کرواتیا - رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ١٩ / ٥ / ١٩٩١ رۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢٢ / ٥ / ١٩٩١، رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی ١٩٩٢ / ٦/٢٥ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ساڵێک.

٤- سلۆڤینیا - رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ٢٣ / ١٢ / ١٩٩٠ رۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢٢ / ٥ / ١٩٩٢ رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی ٢٥/ ٦ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ساڵێک و پێنج مانگ.

٥- ماڵتا - رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم بۆ دەستوری نوێ ٢-٤ / ٥ / ١٩٦٤ رۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ١ / ١٢ / ١٩٦٤ رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی ٩/٢١ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان شەش مانگ .

٦- مۆنتینیگرۆ - رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ٢١ / ٥ / ٢٠٠٦ رۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢٨ / ٦ / ٢٠٠٦ ، رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی ٣/ ٦ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان مانگێک و هەفتەیەک.

٧- لیتوانیا - رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ٨ / ٢ / ١٩٩١ رۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ١٧ / ٩ / ١٩٩١ ، رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی ٦/ ٩ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان حەوت مانگ هەفتەیەک .

٨- ئەرمینیا - رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ٢١ / ٩ / ١٩٩١ رۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢ / ٣ / ١٩٩٢، رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی ٩/٢١ / ١٩٩٠ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٥ مانگ .

٩- ئازربایجان -رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ١٠ / ١٢ / ١٩٩١ رۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢ / ٣ / ١٩٩١ ، رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی ١٠/١٨ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان دوو مانگ .

١٠- تورکمانستان - رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ٢٦ / ١٠ / ١٩٩١ رۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢ / ٣ / ١٩٩٢ ، رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی ٨ / ١٩٩٠ و رۆژی پەسەندکردنی ١٩٩١/١٠/٢٧ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٤ مانگ.

١١- ئۆزباکستان- رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ٢٩ / ١٢ / ١٩٩١ رۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢ / ٣ / ١٩٩٢ ، رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی ٣١ /٨ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢ مانگ .

لەو ئەزمونانەی سەروو بۆمان دەردەکەوێت کە تەواوی لیدوان و تێگەیشتن و ستراتتیژیەتی سەرکردایەتی (پ.د.ک) لەبارەی ڕیفراندۆم زۆر خراپ بەهەلەداچووبوو ، لە پیش ریفراندۆمیش لە تویژینەوەیەک بەناوی (ریفراندۆم بە پیی یاسای نیودەولەتی) دەزگای ستاندەر ئاگاداری

کردبوونەوە ، دەبوایە ئەو هەنگاوانەی خوارەوە پەیڕەو بکرابایە کەچی بەنەشارەزایی کارتەکانی سیاسی ویاسایی و زانستی تیکەل کرا :

1 . ریفراندۆمی سەربەخۆیی کارتی فشارو کارتی دانوستان و هیچ جۆرە کارتیک نیە جگە لە سەربەخۆیی و دەولەت بوون .

2 . ریفراندۆم کۆتایی دانوستان ومفاوەزاتە نەک سەرەتا ، هەم بۆ دەسەلاتی کوردی ناشرینە سەودا لەسەر ریفراندۆم بکا هەم بەغداش ئامادە نابیت دانوستان بکات لەدوای ریفراندۆم ، ئەو وەلامانەی پیش ریفراندۆم دەیدات دوای ریفراندۆم نایدات .

3 . ئەو رۆژەی بە بەلێ سەرکەوتوو دەبێت وەک نەریت سەرۆکەکە لەگەل سەرکردایەتی وولات بە تەنیشت یەکەوە جاڕی ئەو سەرکەوتنە دەدەن و بڕیاڕی جیابوونەوە یەکسەر دەدەن ، واتە جارێکی تر پیویستت بەبەغدا نامێنیت و پەرلەمان ووەزیرو سەرۆک کۆمار دەکشێننەوە .

4 . چەند رۆژێک دوای ئەوە سنورو سیادەی ئەو وولاتە جار دەدرێت .

5 . دوای ماوەیەکی کەمی تر جاڕی سەربەخۆ دەدرێت .

6 . ئەو ٣ هەنگاوەی سەروو جیایە لەگەل دەولەت ، هیچ بیانۆیەک نیە ئەوانە نەکرێت ، ئینجا نۆرەی بینای دام ودەزگای دەولەت دەکری کە لەهەندێ شوێن ماوەی جیاجیای خایاندوە .

لە جیاتی ئەو هەنگاوانە سەرکردایەتی ئەو حزبە دەستی لەکارکیشایەوەو ریفراندۆم سڕکراو وادانوستان لەسەر لەدەستدانی خاک دەکریت .

# لێکەوتەکانی ریفراندۆم وکاریگەری بەسەر (پ.د.ك)

لە دوای شکستی ریفراندۆم جۆرە ووتاریکی ئەوحزبە هاتۆتە کایەوە وەك پاکانە بۆ هەلەی گەورەی سەرکردایەتی (پ د ك)ودەلێن خۆ ریفراندۆمیش نەکرابایە ئەوەی بەسەرمان هات هەر دەهات، لە پیش ریفراندۆمیش ئەو نەخشەیەی عیراق هەبوو... ،پرسیارەکە ئەوەیە مادام ئەو قەناعەتەتان هەیە وهەبوە بۆچی بەشداریتان کرد لە رزگارکردنی موسل و یارمەتی سوپای عێراق تان دا ، هەتا پرس بەپەرلەمانیش نەکرا بۆ ناردنی هیزی پیشمەرگە بۆدەرەوەی هەریم ،ئینجا بۆچی لەبەرامبەر ئەو شەڕەی موسل وئەو هەمو شەهیدە داوای زەمانەتتان نەکرد ،بۆچی لە ڕێکەوتنامە 8 مادەییەکەی (پنتاگۆن – هەولیر –بەغدا- سەبارەت بە بەشداری پیشمەرگە بۆ شەڕی موسل) داوای زەمانەتتان بۆکوردستان و گرەنتی مادەی 140 نەکرد تەنها داوای 415 ملیۆن دۆلارتان کرد(لەمادەی حەفتەم)؟ بۆچی رازی بوون هیزی عێراقی بەناو هەریم بیت و عەبادیش سەرکردەی هەمو پرۆسەکە بێت بەهیزی پیشمەرگەشەوە(مادەی چوارەم) ؟ ..لە ڕاستیشدا ئاوا نیە بێ ئەو ریفراندۆمە واڕووی نەدەدا ، ڕاستە وولاتانی داگیرکەری کوردستان هەردەم لە مەلاسن بۆ زال بوونەوە ، بەلام دەرفەتیان نەمابوو ئەو ریفراندۆمە دەرگای بۆکردنەوە ، باشترین دەرگا لەوە هات کە بینیان پشتیوانە نێودەولەتی بۆکوردستان نەما ، هەمو ئەوانە بەڕوونی دەری دەخا سەرکردایەتی ریفراندۆم هەلەیەکی ئەوەندە کوشندەیان کردوە زیانی هەرتەواو نابێت .

زۆر جار باس لە بوون بەدەولەتی کوردستان و سەربەخۆ وەرگرتن وەک نەشتەرگەری دڵ کراوە ، خۆ هەرکاتیک پزیشکی نەشارەزا ئەو نەشتەرگەریە بکەن زیان بەدل و ژیانەکەشی دەگەیەنن ئەگەر مرداریشی نەکەن ، سەرکردایەتی (پ.د.ک) وحزبەکانی ریفراندۆم زۆر نزیکن لەو وەسفە، بۆیە لە ئیستادا ریفراندۆمەکە لە مەترسیدایەو تەنانەت پرۆژەی دەولەت بوونیش زۆر دوور کەوتەوە ، لە جیاتی قازانج تووشی زیانی گەورە بوە ، زیانەکانی لە قۆناغی ئیستا باس دەکەین ئەگەری زیادو کەمیشی هەیە لە داهاتوویەکی نزیک :

١- تاوەکو ئێستا ریفراندۆم رێک پێچەوانەی مەبەستەکەی خۆی پێکاوە، لە جیاتی ئەوەی کۆدەنگیەک دروست بکرێت بۆ پرسێکی چارەنووسساز بوویتە ناکۆکی و تۆمەت بەشینەوە (لە ناوەخۆ) کەچی ریزەکانی سونەو شیعەی عێراق عەلمانی و ئاینی ناوچەکەو جیهانی یەکخست .

٣- گورزیکی زۆر گەورە لە دیپلۆماسیەتی کوردی کەوت .. لە کۆی پینج خاوەن ڤیتۆ چوار دژی وەستا، دواى بةفةرمى بةكؤى دةنطى ئةنجومةنى ئاسایش دذى وةستان ،ئةمريكاو بةريتانياوفرنساو روسيا و يةكيتى ئةوروثى دژی وەستان ، ....دەرکەوت ئەو هەمو ئیدیعایەی سەردانەکانی دەرەوە ی سەرکردە کوردەکان گوایە باسی دەولەتی کوردیان کردوە ، یان دەگۆترا کۆمپانیە بیانیەکانی نەوت یالپشت دەبن... ئەساسیکی وای نەبوو.

٤- به هۆی خالی(سێیەمەوە)بۆ یەکەم جار لەسەدەی نوێ جورئەت هاتەوە بەر وولاتانی ئیقلیمی کۆبونەوەو بڕیاڕی هاریکاری دژ بە کورد بکەنەوە . کار گەیشتە ئەوەی لە ١٥ ی ئاب سوپاسالاری ئێران حسێن باقری وسوپاسالاری توکیا هولوس بگەنە ریکەوتنی سەربازی دژ بە هەریم هەرەدوایش هەر ٣ لا پیکەوە هاریکاریان کرد بۆ گرتنەوەی کەرکووک وناوچە دابڕێنراوەکان .

٥- خودی پرۆژەی دەولەتی کوردستانی کە زۆر نزیک ببۆوە گورزی پێکەوت و جارێ دوو ر کەوتەوە .

٦- لەگەل ئەو هەمو زیانە راستەوخۆیانەی لەدوای ریفراندۆم رووبەرووی ئەو حزبەو هەریمی کوردستان بوویتەوە کەلەسەروو باس کراون و تەواوی ناوچە دابرینراوەکان لەدەستدراوباقیەکەی تریش لە ژیرهەڕەشەیە ،ئینجا ئەو فیدرالیەگەرەیەی پیشوو بچوک دەبێتەوە بۆ فیدرالیەکی پابەند بەدەستوری عێراق ، ئەوەش راستەوخۆ کاریگەری لەسەر چارەنوسی (پ د ک) دەبیت کە دوا بڕگەو ئامانجی ئەو توێژینەوەیە .

# چارەنوسی (پ.د.ک) دوای شکستەکانی ریفراندۆم

ئاسۆی مانەوەو گەشەی ئەو حزبە زۆر تەسک بوویتەوە، ئەوەش بوو بە خیرایی لەو بریارِەی رۆژی ١٦ی مانگ پاشگەزبۆوە بۆ بوون بەدوو ئیدارەو دەرکردنی یەکەی ٧٠ و گەرِانەوەی بارەگاکانی (پ د ک)لەلای سلیمانی ، چونکە بۆیان دەرکەوت قەتیس مانەوەی(پ د ک)بەتەنها لە هەولیرو دهۆک زیاتر دەکەویتە مەترسی، چواردەوری دۆستێکی نەماوە ، لەلای شاخەکانی بادینان پەکەکەیە کراوەتە ناحەز،لەسەروو تورکیایە دوژمنیەتی، لەناوەوەشی زیاتر لە ٨ پیگەی سەربازی تورکیای لێیە، لە سنوری رۆژئاوای سوریایە دوژمنیەتی ،لەخوارووی رۆژئاوا یەپەگە و یەپەژە کراونە ناحەز ، لە خواروو سوپای عێراقە دوژمنیەتی ، لەناوەخۆو سنوری رۆژهەلاتی بریتیە لە گۆرِان ویەکیتی وکۆمەل و ..هەموی کراونە ناحەز ، بەهەلس وکەوت و نەشارەزایی وای لە خۆ کردوە لەو دونیا پان وبەرینە بەتەنها بمینێتەوەو رِووناکیەکیش لە ئاسۆ دیارنیە بۆیان، هەروەك بارزانی خۆشی ووتی (بەراستی دەرکەوت، کە دەبێت نەتەوە زولْملێکراوەکان پشت بەخۆیان ببەستن، ئەو هەموو بانگەشانەی بەناوی مافەکانی مرۆڤ و مافی گەلان و ئازادی و دیموکراسی هیچ بنەما و ئەسلْ و ئەساسی نیە- گفت وگۆی لەگەل کەنالْی CNN) بێپشتیوان ماینەوە ، دەبێت ئاگاداربین ئەوجارە شاخەکانیش دۆست نینتوورِەنە)بەهۆی بێوەفایی وگەندەلی بەرپرسان ، لەلایەکی تریش ئەو حزبە وەک جاران بنەمای کوردایەتی وهیزی ئایدیۆلۆجی نەماوە ،بۆیە سروشتی

جەماوەریەکەشی زۆر لەرزۆکە ،زۆرترین دەنگی (پ د ک)لە ناوچەیەکی تەسکە ٢٧ کورسی لیهیناوە ،ئەو ناوچەیەش لە هەمو ئەو لایەنە لەمەترسیدایە ،تەنانەت مەترسی بوونیان(بەشیکیان)بەچەکداری(حەشدی کوردیش) هەیە ، لەگەل زۆر خالی لاوازی تر بۆ بچووک بونەوەو لاواز بوون .

یەکەم بچووکبوونەوە لەدوای ریفراندۆم شکستە سەربازیەکەی رۆژانی 16ی ئۆکتۆبەر بەدواوەو شکستەکانی سیاسی و سازشەکانی بەدواهات.. تا نەمانی پۆستی سەرۆکایەتی هەرێم و دەستلەکار کێشانەوەی سەرۆکی ئەو حزبە بوو، لەوەش خراپتر ئەوەبوو ئەمریکاو زۆربەی وڵاتانی جیهان بەگەرمی پێشوازیان لەو هەنگاوەی کرد، دەبێ تێبینی بکرێت ماوەیەکی زۆرە ئەمریکاو پشتیوانە نێودەوڵەتیەکان کارەکانی ئەو سەرکردایەتیە بە باش نازانن، بە تایبەتی ریفراندۆم، ئەوە یەکەم جارە دەستخۆشی بۆ کارێکی سەرکردایەتی بکەن، ئەوەبوو کە ریفراندۆمیان سڕکرد، دووەمیشیان کە سەرۆکی (پ.د.ک) دەستی لەکار کێشایەوە، تەنانەت لەناو کۆمەڵگەی کوردەواریش کاردانەوەکە هەمان ئەوەبوو ئەوەی کە ئەمریکا کردی، تەنها هەندێ خەڵکی تایبەتی لەو حزبە ناڕازی بوون و هێرشیان کردە سەر پەرلەمان و حزبەکانی تری کوردستان، ئەوانەش لەلایەن حکومەت و خودی ئەو حزبەش بە (گێرەشێوێن) وەسف کران، لە راستیدا ئەوانە دڵسۆزی ئەو سەرکردایەتیە بوون، بۆیە ئەو وەسفە لەلایەن حکومەتی هەرێم بۆیان مانای گواستنەوەیە بۆ قۆناغی دوای عەقڵیەتی ریفراندۆم وعەقلیەتی سەرکردەکانی سەدەی بیستەم.

ئەو بچووکبوونەوەی(پ.د.ک)هەرتەنها بەهۆی ریفراندۆم نەبووە، بەڵکو کەڵەکەبووی چەندینساڵیەتی، لەهەمان کات کەڵەکە بووی فرە ڕەهەندە لە شکست و هەڵەی ستراتیژی، بۆیە بچووکبوونەوەو دابەزینی بەچەندین قۆناغدا دەروات، ئەوەی ڕوویدا لە رۆژی 16 / 10 / ٢٠١٧ تاکو 29 / 10 /2017 ئەوە قۆناغی (A) بوو، قۆناغی (B) جیا دەبێت لەگەڵ (A)، مەرج نیە ئەو کاردانەوانەی لە (A) هەبوو ئاوا لە (B) هەبێت، چونکە ژانی بچووکبوونەوە لە یەکەم هەنگاو (A) زۆر جیا دەبێت لە ((B، C))و ......هتد، لە کۆتاییدا ئەو حزبە بەرەو ئەوە دەچێت چەند کورسیەکی بمێنێت، مەرج نیە لە هەڵبژاردنی داهاتوو یەکسەر وای بەسەر بێت، ڕوونە لە کۆتاییدا واتا لە هەرەدواییدا کورسیەکانی زۆر کەم دەبێتەوە بۆ چەند کورسیەک چونکە ئەو حزبە دەستکورتە لە بنەماو ئایدۆلۆژیا و فکر و نەخشەو پلانی ستراتیژی، زیاتر دەوڵەمەندی ئەو حزبە لە بەهێزی سەرکردە مێژووییەکانی سەرچاوە دەگرێت، لە دوای ساڵانی ٢٠٠٦ بەدواوە پرۆسەی گەندەڵی و تاڵان و خۆ ویستی بەرپرسانی ئەو حزبە گورزی زۆر گەورەی لە سەرۆکە سیمبولیەکانی دا، دیمەنی لەناو کوردستان ناشیرین کرد، واتا تاکە سەرچاوەی هێزی لاواز کرد(هەر خۆ بە خۆ)، لەو دواییە هێزی ئەوەی مابوو دەوترا ئەو بەدیلی نیە لەبەر ئەوەی لەلایەن هێزە ئیقلیمی و جیهانییەکان قەبووڵە، کەچی لەدوای ئەو ریفراندۆمە ئەو هێزەشی لەدەستدا بووە خواستێکی ناوەکی و کوردستانی و عێراقی و ئیقلیمی و جیهانی بۆ دەست لەکارکێشانەوە، کەواتە ئێستا ئەو حزبە هێز و مقەوەماتی مانەوەی بەو قەبارە گەورەیەی لەژێر هەڕەشەی راستەقینەیە بۆ بچووک بوونەوە،

بۆ پرۆسەی (موت البطیء) ، دەبێ وردبین نەوتراوە بۆ (موت البطیء) وتراوە بۆ پرۆسەی (موت البطیء) واتا ئەو حزبە نامرێت بەڵام زۆر بچووک دەبێتەوە، ئەوەش چارەنووسی ئەو حزبەیە بە پێی ئەو بارودۆخەی ئێستای ئەگەریش هەیە فاکتەری ناکاویش بێت و معادەلەکە بگۆڕێت.

# خاڵی بە"هیز و لاواز"ی (پ.د.ک) لە داهاتوودا

خالی بەهیزی ئەو حزبە لەو خالانەیە :

١- لەناوەخۆی (پ د ک)تا ئەوساتەش کیشەو درز نیە. ٢- پارەو ئیمکانیەتەکی زۆری هەیە ٣- حزبە کوردستانیەکانی تر زۆر یارمەتیدەرن تا ڕادەی خۆبەخشی ٤- لایەنە معارەزەکانیش تاڕادەیەک سستن لەهەنگاو و دەستپیشخەری بۆ بەدیل بوون ، بۆیە بوار هەیە بۆ( پ د ك) کە چاکسازی بکات و سەرکردایەتیەکی نوی دروست بکەن وبتوانن لەگەل لایەنەکانی کوردستان خۆ ریکبخەنەوەو لەچوارچیوەی حزبە کوردستانیەکان (بە ئۆپۆزیسۆنیشەوە) خۆ بشارنەوە لەو شەپۆلە سزاو بچوکبوونەوەیە دەرچەیەک بیت بۆیان .

هەرچی خالە لاوازەکانی ئەوحزبەیە لەسەروو باسکرا زۆرە،دەمینیت ئەو ئاماژانە دیاری بکەین کە شکست وبچوک بوونەوە وارووبەرووی ئەوحزبەو سەرکردایەتیەکەی دەبیتەوە ،ئەو حزبە دەرفەتی زۆر زێڕینی بۆهاتە پیش ، لە ئیمکانیەتی مادی و هێزو دەسەلات و یاساو حکومەت و بئابووری وبێدەنگی میلەت ومعارەزەو پشکی نەوت لەبەغداو داهاتی ناوەخۆو نەلە کوردستان و نەلە عێراق دەزگایەك نەبوو بتوانی چاودێری و سزای هەبێت بەسەر ئەو حیزبە و سەرکردایەتیەکەی ئەو حزبە بە 38 کورسی کەوتبوە سەرووی یاسا و پەرلەمان و دادگاو لێپێچینەوە، کەچی لەدواییدا شکستی هێناو هەرێمی کوردستانیان لە هەمو ئاستەکانی (نیشتمانی- ئابووری - سیاسی - ئیداری- فەرهەنگی- تەعلیمی) بە وێرانی بەجێهێشت ،

لەهەموی سەرنجراکیش تر بەدەیان ملیار دۆلار قەرزاریشن ، جاریکی تر ئەو دەرفەتە ناگەڕێتەوە بۆیە بواری هەلسانەوە تائەو ڕادەی ئیستا نیمچە مەحالە ، ...ئاماژەی لاوازبوون:

یەکەم - جاران بەهەرچی بیانۆیەک بیت رازی نەبوون سەرۆکیان ئیستقالە بدات ودەیان ووت (کاتی جەنگ نابیت –تادەولەت دروست کردن ئینجا وازدەهینیت – تا بەدیلیک ...زۆری تریش)کەچی ئیستا هەم شەرەو هەم دەولەتیش دروست نەبوە ..کەچی دەستی لەکارکیشایەوە .

دوەم - ئەو گوتارەی سەردەمی ریفراندۆم زۆر توند بوو دەیان ووت (دەولەتیکی فیدرالی دیموکراسی پیک دەهینین –دەیانووت دانوستان لەگەل عێراق تەنها لەسەر ئەوەی دوو دراوسیی باش بین، دةیان ووت هیچ دەولەتیك یەك سەنت ناتوانیت بیتة ناو کوردستان ، تەنانەت کاك مسعودبارزانی ووتی( هەرلایەك بەهیزبیوێ بیتە ناوکەرکوك کاریکی وایان بەسەر دەهینم خۆشیان تەسەورناکەن چیان بەسەر دێت) کەچی هەمو ئەوانە ڕوویدا ئیستا تەنازولی واگەورە دەکەن سرکردنی ریفراندۆم و پارانەو لەم ولەو گەرانەوە بۆ بەغداو بۆ وولاتانی تر .

سێیەم - هەلەی سەرکردایەتی ئەو حزبە خۆی وای لەخۆکرد لیرە بەولاوە تاکە مەرجەعی هەریمی کوردستان بەغدا بیت ، ئیستا سەرکردایەتی ئەو حزبە چۆن چارەسەری ئەو پرسەسەختانەی خوارەوە دەکەن

1- لەریکەوتنە 50 ساڵیەکەی لەگەڵ تورکیا .
2- ئەو گرێبەستە نەوتیانەی لەگەڵ کۆمپانیاکان کردوویانە و عێراق

هەر لەو کاتی بەبەیان کەدانیان پیّ نانێن .

3- ئەو هەمو دۆسیەی گەندەلیە بچووك وگەورەکان .
4- ئەو هەمو پارە وپوولەی بانکەکانیان .
5- بوونی چەك بەدەستی حزبەوە
6- بوونی زیندانی و هیزی تایبەتیە شەخسیەکان .
7- دەیان دۆسیەی تری مەترسیداری وەك: (بوونی هیزەکانی تورکیا لەهەریم – قاچاخی لەگەڵ داعش –کەوتنی موسل –چەکە قورسەکان – چەکی سوپای عێراق لەکاتی کەوتنی موسل - ...زۆری تر)
8- واش پیدەچی دەرگایەکی مەترسیداری تریش بکریتەوە بۆ ئەوهاوولاتی وئەو حزب ولایەنانەی زولمیان لیکراوە لەکوردستان پەنا بۆ دادگای عێراقی ببەن دژ بەبەرپرسان ودام ودەزگای تر .

ئەوانە هەمووی مەترسی راستەقینەو نزیکن ،ئاماژەی بچوك بوونەوە بە ئاشکرا دیارە ،کاتی خۆی ئەو حزبە لەسەرانسەری کوردستان هەبوو ،ئیستا تەنها لەباشوری کوردستان ماوە ، لەباشوریش دەنگەکانی لەکەم بوونەوەدایة سەرەڕای ئەو هەمو ئیمکانیەت ودەسەلاتەی (لە یەکەم هەلبژاردن ٥١% لەدووەم بۆ ٤٨% لە سێیەم بۆ ٤١% لەچوارەم بۆ ٣٨%)، لە ئیستاشدا دەنگەکانی چڕ بوویتەوە لەناوچەیەکی بچوکی هەریمی کوردستان 27 کورسی لە شاریك و 11 کورسیش بۆ هەولیروسلیمانی و رانیەو هەلەبجەو کەرکوك ، بەهەمو پێوانەیەك لە بچوك بونەوەیە ، ئەو مەترسیانەی سەرووشی واڕووبەڕوو دەبێتەوە ، بۆیە چاکترین دەرچە

ئەوەیە سەرکردایەتی ئەو حزبە دان بەو هەڵەو چەوتیە گەورانە بهێنی وبیت ئاشتەواییەکی گەورەی سەرتاسەری ڕابگەیەنێت و دەسەلات تەسلیمی معارەزە بکات تا هەڵبژاردنی داهاتوو خۆی جوان تر بەقەبارەی تازەی خۆی ئامادە بکاتەوە بۆ هەڵبژاردنێکی ڕاستەقینە .

# دەرەنجام

چارەنوسی پارتی دیموکراتی کوردستان دوای ریفراندۆم، توێژینەوەیەکە لە لایەن (ناوەندی تویژینەوەی)دەزگای ستانداردەوە ئەنجام دراوە ، هەول دەدات لێکدانەوەیەکی ورد بۆ ئایندەی ئەو پارتە بکات. لەسەرەتادا ئەم توێژینەوەیە باس لە دەروازەی ناساندنی پارتی دیموکراتی کوردستان دەکات کە بە ئەرکێکی گەورەی ریفراندۆم هەلساوە، بە ئامانجی بەدەستهێنانی دەنگی بەلێ بۆ سەربەخۆیی کوردستان، هەرچەندە دەنگی جیاواز بەرزبووەوە کە ئەم پارتە مەبەستی نیە سەربەخۆیی هەرێمی کوردستان بەدەست بهێنێت و ئامانجی تری لەپشتەوەیە.

هەنگاوەکانی ریفراندۆم هەنگاو هەنگاو چووە پێش سەرەرای فشاری عێراقی و ئیقلیمی و نێودەولەتی بۆ ئەنجام نەدان یان دواخستنی ، بەلام پارتی دیموکراتی کوردستان ئامادەی پاشگەزبوونەوە نەبووە، لەو ماوەیەدا چەندین هەلەی کوشندە بەرۆکی گەلی کوردی بەگشتی و پ.د.ك بەتایبەتی گرتەوە، تێکرای پەیوەندیەکانی هەلوەشاندنەوە کە چەندین سال بوو بنیادنرابوو.

تەنانەت پەیوەندی ئەمریکا و پ.د.ك کێشەی تێکەوت هەلەی ستراتیجی ئەنجام درا، نەك لە سەربەخۆیی نزیك نەبووینەوە بەلکو شاری کەرکوك و ناوچە کێشە لە سەرەکانیشمان لەدەستدا کەکرۆکی کێشەی

هەرێم و بەغداد بوون، لەنێو ئەو بارودۆخ و پێشهاتەدا چارەنوسی پ.د.ك بەرەو خراپی چوو،سەرکردەی یەکەمی پارتەکەی دەستی لە سەرۆکایەتی هەرێم کێشایەوەو کێشەگەلی نوێ سەری هەلدا، بەبۆچوونی ئێمە لێرەوە لاوازی پ.د.ك دەست پێ دەکات بەرەو ئایندەیەکی خراپ هەنگاو دەنێت رەنگە لە هەنگاو نان بەرەو لاوازی و پۆکانەوە بەردەوام بێت.

ئەم توێژینەوەیە گەیشتۆتە چەند راسپاردە و ئەنجامێك بە هیوای ئەوەی سودی بۆ(پارتی دیموکراتی کوردستان)و خوێندەواری گەلەکەمان هەبێت، شوێنێك لە پرۆسەی سیاسی کوردستان پرکاتەوە، خزمەتێك بە سیستەمی سیاسی بکات و هەول بدرێت هەلە بە هەلە چارەسەر نەکرێت سوود لە شکستەکانی رابردوومان وەربگرین، کە خۆی لە چەند خالێکدا دەبینێتەوە:

١- پارتی دیموکراتی کوردستان، کەداکانەی پارتە سیاسیەکانی کوردستانە، بەلام نەیتوانیوە لە ئاست ئەرك و رۆلی کاریگەری خۆیدا سەرکەوتوو بێت، سەرەرای زۆرینەی جومگەکانی دەسەلاتی کوردستانی بەدەستەوە بووە، لەکۆتاییدا وەکو پارتێکی لۆکالی ماوەتەوە.
٢- پارتی دیموکراتی کوردستان هەلەی ستراتیجی ئەنجام داوە، رەنگە بەرەو لاوازتر و دارمانی سیاسی بەرێت و نەتوانێت لەنێو هاوکێشە سیاسیەکاندا خۆی بدۆزێتەوە، لەبری بەدەست خستنی دەولەتی سەربەخۆیی کوردی، کوردستان بەرەو دابەشبوونی زیاتر بەرێت.

٣- پارتی دیموکراتی کوردستان کێشەی لەگەل زۆرینەی پارتەکانی کوردستان هەبووە و نەیتوانیوە برا گەورەیی بۆخۆی دروست بکات و لە قاوغی حیزبی و بەرژەوەندی تایبەتی تێپەربکات.

٤- جەنگ و ململانێی نێوخۆیی بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردستان تێپەری نەکردووە کەچی هەنگاوی مەزنتر دەنێرێت بۆیە رىفراندۆم لەبری دەستکەوتی زیاتر، بووە شکست و لەدەستدانی زیاتر.

٥- پارتی دیموکراتی کوردستان نەیتوانیوە لە ئاست پێشگرتن بە گەندەلی و خزم خزمێنەو بەخشینەوەی داهاتی ولات بە ناشەرعی هەلوێستی جدی و کرداری هەبێت.

٦- پارتی دیموکراتی کوردستان هیشتا پارتێکی بنەمالەی کلاسیکی بووەو نەیتوانیوە ئەو قۆناغە تێپەربکات و ببێتە پارتێکی مۆدێرنی پێشکەوتوو،کەبتوانێت جێگەی تموحی هەمەلایەنەی چین و توێژەکان بێت بۆیە بەراورد بە ٢٦ سالي حكومراني نزيكەي ٣/١ دەنگەکانی لە دەست داوە ..واش چاوەڕوان دەکرێت ڕوو لە خراتر بێت .

ڕاسپاردەی گشتی ئەوەیە چیتر گوێ لە وەسفی ناڕاست نەگرێ و چاکسازی ڕیشەیی بکات ، دەست گۆڕی دەسەلات لەناو حزبەکە بکرێت ، ئاشتەواییەکی نیشتمانی لەگەل حزبەکانی ترو خەڵکی هەژاری کوردستان بکات .

# مصير الحزب الديمقراطي الكوردستاني بعد الاستفتاء

## الملخص

هذه الدراسة، هي محاولة جادة من مركز بحوث مؤسسة ستاندر لمعرفة "مصير الحزب الديمقراطي الكوردستاني بعد الاستفتاء".

والدراسة تتضمن تعريف الحزب الديمقراطي الذي قاد عملية الاستفتاء، فالمزايا والمساوئ التي اتسم بها الحزب في طريق نضاله السياسي. وتطرقنا أيضا إلى العوائق التي صادفت الحزب وعلى الأخص الدبلوماسية والسياسية منها. وأخيرا تناولنا مصير الحزب في خضم فشله في حصد ثمار الاستفتاء وتصادمه مع القوى الداخلية والعراقية والإقليمية والدولية.

وقد توصل البحث إلى نتائج، أهمها:

- إن الحزب الديمقراطي الكوردستاني وإن كان صاحب الكلمة الفصل في كوردستان، إلاّ أنه لم يستطع حمل الأمانة الكبيرة التي كانت على عاتقه، وهذا ما أبقاه حزبا محليا بعيدا عن صنع القرارات الإستراتيجية للمنطقة.
- إرتكب الحزب الديمقراطي أخطاء إستراتيجية، فقادته إلى الضعف والانهيار السياسي في المعادلات الإقليمية والدولية. فعوضا عن تأسيس الدولة الكوردستانية، ساق كوردستان إلى المزيد من الانقسام والشقاق.
- إن الحزب الديمقراطي لم يستطع مواجهة الفساد والمحسوبية وإهدار المال العام، بل كان المحفز والمتغاضي عن كل هذا.
- إن الحزب الديمقراطي حزب عائلوي كلاسيكي لم يستطع الخروج من هذه المرحلة بنجاح، فقد نأى بنفسه عن الحداثة والتقدم ليصبح عند طموحات مختلف الطبقات والشرائح، وهذا ما أفقده سمة الجماهيرية لتهبط شعبيته إلى ثلث الأصوات خلال ست وعشرين سنة فقط.

# The destiny of Kurdistan Democratic Party after the referendum


## Abstract

Kurdistan Democratic Party's fate after referendum is a paper done by (Standard Institute) to analyze the future of this party precisely. At the beginning، the paper gives an introduction about Kurdistan Democratic Party (KDP) which is mainly held responsible for conducting the referendum on (Sep 25، 2017) at the aim of achieving (yes vote) for Kurdistan Independence. Even though، there were different voices raised and stating that this referendum is not for independence، but there are other purposes behind it.

The referendum moved forward step by step despite pressures by Iraq، neighboring countries and the international community for not conducting it or postpone it، but (KDP) was not willing to do so. During that period، a lot of terrible wrong doing faced The Kurdish people in general and (KDP) particularly. And that affected its relations with neighboring and international community.

Even the relationship between America and (KDP) turned bad due to a strategic mistake which was made by the Kurdistan Democratic Party. Obviously، not only we did not get close to Independence rather we lost Kirkuk and the disputed territories which have been considered the core problem between Erbil and Bagdad for a long time.

# The destiny of Kurdistan Democratic Party after the referendum

Kurdistan Democratic Party's fate after referendum is a paper done by (Standard Institute) to analyze the future of this party precisely. At the beginning, the paper gives an introduction about Kurdistan Democratic Party (KDP) which is mainly held responsible for conducting the referendum on (Sep 2017 ,25) at the aim of achieving (yes vote) for Kurdistan Independence. Even though, there were different voices raised and stating that this referendum is not for independence, but there are other purposes behind it.

The referendum moved forward step by step despite pressures by Iraq, neighboring countries and the international community for not conducting it or postpone it, but (KDP) was not willing to do so. During that period, a lot of terrible wrong doing faced The Kurdish people in general and (KDP) particularly. And that affected its relations with neighboring and international community.

Even the relationship between America and (KDP) turned bad due to a strategic mistake which was made by the Kurdistan Democratic Party. Obviously, not only we did not get close to Independence rather we lost Kirkuk and the disputed territories which have been considered the core problem between Erbil and Bagdad for a long time.

November 2017

STANDARD

www.skurd.net

info@skurd.net